کوردستان له سه‌فه‌رنامه‌ی بیانیدا - ٩

# سه‌فه‌رنامه‌ی جاکسۆن

# بۆ

## باشووری کوردستان له ساڵی ١٧٩٧

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

وه‌رگێڕانی:

**ره‌سوڵ به‌ختیار**







٢٠١٣

# سەفەرنامەی جاکسۆن بۆ باشووری کوردستان لە ساڵی ١٧٩٧

وەرگێڕانی

رەسوڵ بەختیار

سەرپەرشتیار

رابیعە فەتاح شێخ محەمەد

هەولێر - ٢٠١٣





پرۆژەی هاوبەش

خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە          کۆمەڵەی ئینسکلۆپیدیای کوردستان

- **کوردستان لە سەفەرنامەی بیانیدا ـ (٩)**
- **سەفەرنامەی جاکسۆن بۆ باشووری کوردستان لە ساڵی ١٧٩٧**


- وەرگێرانی: رەسوڵ بەختیار
- سەرپەرشتیاری پرۆژە: رابیعە فەتاح شێخ محەمەد
- نەخشەسازی ناوەوە: رێدار جەعفەر
- بەرگ: هۆگر سدیق
- نرخ: (٢٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم: ٢٠١٣
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: (٣٣)
- چاپخانە: موکریانی (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٨٠٣)



www.mukiryani.com :ماڵپەڕ
info@mukiryani.com :ئیمەیل

# پێرست

## پێشەکی:

جاکسۆنی گەڕیدە یەکێك لەو گەڕیدە ئینگلیزانە وهاتۆتە عێراق ودواتر لەوێوە چۆتە باکووری کوردستان، لەنێوەندی گەشتەکەیدا خستویەتییە روو، هەر لەبەسراوە تا دیار بەکر ونسیبین، ئەوەی بەچاوی خۆی بینووە باسی لێوە کردووە، لەهەندێك شوێندا باس لەپۆشاك وجلوبەگ وئەو چەکانە دەکات، کە ئەو کات باو بووە، هاوکات لە باشووری عێراقدا باسی زۆر شتی کردووە، کە جێگەی سەرنج بێ.

ئێمە لێرەدا بەکورتی وەرمانگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، کاتێکیش دێتە کوردستان هەر لە زنجیرە چیای حەمرین وتوزخورماتووە باس دەکات تا دەگاتە شاری نسیبین، لەهەندێك شوێندا باس لەگەورەیی ومەزنایەتی قەلآی هەولێر دەکات وجەخت دەخاتە سەر ئەوەی سەردەمانێك شوێنێکی گرنگ بووە.

کاتێکیش باس لەشاری مووسڵ دەکات وتیشك دەخاتە سەر ئەوەی، کە سەرەڕایی ئەوەی لە مووسڵدا چەندین ئایینی تیادا هەبووە، بەلآم زۆربەی دانشتتووانی ئەو شارە کوردن.

لەدووتۆیی ئەم پەرتووکەدا چەندین خاڵ دەبینی، کە شایەنی ئەوەیە هەڵوەستە بکەی، هەرچۆنێك بێ، ئەم گەشتە بەهەر مەبەستێك ئەنجاندرابێ، بەلآم ئەجۆرە گەشت وگەڕانە بێگومان بەمەبەستێك ئەنجامدراوە، تا خوێنەرانی پێ ئاشنا بکات.

جاكسۆن وەك خۆی باسی لێوە دەكات، لەزۆر شوێن رووبەڕووی ناخۆشی بۆتەوە تا ئەو رێگەیەی بڕیوە، لەهەندێك شوێنیش رووداوەكانی زۆر لا مەزن بووە، هاوكات زۆربەی باسەكانیشی بەرووكەشی باس كردووە ونەچۆتە نێو كرۆكی باسەكاندا، لەلایەكی دیكەوە جاكسۆنی گەڕیدە تەنها بۆمان دەگێڕێتەوە وخۆی ماندوو نەكردووە تا بچێتە نێو ناخی باس وخواسەكانی ئەو كاتە.

هیوادارم خوێنەران سوود لەهەموو هەنگاونانێكی ئەو گەڕیدەیە وەربگرن وبۆ نێو خودی باس خواستەكانیان وتویژینەوەكانیان كە سەبارەت بەكوردستان وشارە كوردییەكان ئەنجامی دەدەن.

**رەسول بەختیار**
**هەولێر ـ كوردستان**
**٢٠١٢/٨/٢**

لەکاتژمێر هەشتی ئێوارەی رۆژی چواری ئەیاری ساڵی **١٧٩٧** لەبۆمبایەوە بە کەشتی (**بیرل**) بەرەو بەسرا گەشتەکەمان دەستی پێکرد، کە کابتن (**رسبنس**) سەرۆکایەتی گەشتەکە وکەشتیەکەی دەکرد، هاوکات لەتەك مندا بەرێز **جیمس ستیفنز** کە یەکێك لە فەرمانبەرە مەدەنیەکان وجەنەراڵ جۆن ریدم کە ئامری فەوجی میر پاشایەتی هیندی بوو، ئەوە جگە لە جیمس مۆرلی لەگەڵدا بوو، ئێمە کەش وهەوایەکی خۆشمان دورستکرد، لەدەرەوەش بایەکی نزم لە رۆژئاوای باکوری رۆژئاواوە بەرەو رووماں دەهات، ئەم بایە تا رۆژی دوانزدەهەمی ئەو مانگە بەردەوام بوو، کە لەپلەی ٩،١١ی باکوور وپلەی ٦٢/١٦ی رۆژهەڵات بوو لەسەر پلەکانی هێڵی درێژی، دواتر بایەکە زۆر توند بوو وئاسمانیش بەرەو تەمبوون دەرۆیشت.

هەروا لەپانزدەی ئەو مانگەدا کە لەپلەی ١٤ی هێڵی درێژیدا بووین، شنەبایەکی خۆش لەباکوورەوە هات، بەڵام زۆری نەبرد بایەکی توند بەرەو رۆژهەڵات هەڵیکرد، لەکاتژمێر یەك ونیوی رۆژی حەڤدەی ئەو مانگە کەشتیەك لەدووری چارەگە میلێك لە رۆژهەڵاتەوە دەرۆیشت، بەڵام لەرۆژی دواتردا ئەو کەشتیە بەرەو باشووری رۆژهەڵات رۆیشت، کە بەدووری پێنج تا شەش میل لێمانەوە دوور بوو، ئێمە وامان زانی ئەوە ئەو کەشتیە ناسراوەی عەرەبەکان کە ناوی (**نجمة الصباح**)، بەهۆی خێرایی ئەو کەشتیەش شنەبایەکی خۆش دەهات، هاوکات لە رۆژی هەژدەهەمی ئەو مانگەدا زریانێکی توند لە رۆژئاواوە بەرەو رووماں هات وئاسمانیش پڕ لەهەور، ئەمەش بووە هۆکارێك لەکاتژمێر دووی پاش نیوە شەو کەشتەکەمان بەردو باشوور هەنگاو بنێ، بەڵام لە بیستی مانگەوە هەموو با وزریانەکان بوون بە بایەکی خۆش، ئەمەو کەشتیەکەمان بەخێرایی پێنج تا شەش عوقدە دەرۆیشت، هاوکات لەکاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ وشکانیمان لەدووری پێنج گەزەوە بینی ولەوێشدا چەندین لە بەلەمەکانی عەرەبیمان بینی، دواتریش تا کاتژمێر پێنجی ئێوارە بە (رأس الغاتدا-لەوانەیە مەبەستی راس

**الغيث** بێ کە لەدوورگەی عەرەبیدایە) دەسوڕاینەوە، کاتێك کە رۆژ بۆوە لەرۆژی بیست ویەکەمینی ئەیاردا دوو بەلەمی عەرەبیەکان لێمان نزیك بوونەوە کە ماسیەکی زۆریان هەڵگرتبوو وئێمەش بە نرخێکی لەبار ماسیمان لێیان کڕی، هەروا لە کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ بایی باشووری رۆژهەڵات کەشتیەکەمانی بەرەو شوێنی مەبەست دەبرد، ئێمە لەدوورەوە بینیمان وهەستمان بەوە کرد دوو بەلەمی چارۆگەدار راومان دەنێ، لەوە ترساین کە چەتەکانی دەریا بن، چونکە چارۆگەکان زۆر زۆر بەتوند بوو بوو وبەلەمەکانیش بەخێرایی دەهاتن، پاش ئەوەی تەنها سی هەنگاو لێمان نزیك بوونەوە وسلاّویان لێکردین دواتر دلّنیا بوونەوە ئێمە کێین بەرەو کەنارەکە هەنگاویان نا.

کاتێکیش کە رۆژ بۆوە لە رۆژی بیست و چواری ئەیار سنووری دوورگەی قشم بەدەرکەوت کە یەکێکە لەدوورگەکانی دوورگەی عەرەبی، لەدووری چەندین گەز لە دوورگەی هورمز کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی ئەو دوورگەیە، لەوێوەش بیست ودوو بەلەم راوەدوویان دەناین وچەندین هەنگاو لێمان نزیك بوونەوە، ئەمەو ئەو بەلەمانە هەر یەکەو چەندین پیاوی تیا بوو کە چەکیان بەدەستەوە بوو، ئێمەش بەخێرایی چووینە نێوەندی کەشتیەکەوە و خۆمان ئامادە کرد بۆ هەر ئەگەرێك، ئەوە جگە لەوەی لەدووری ئەو بەلەمانەوە چەندین کەشتی گەورە بەخۆیان وتۆپهاوێژەکانیان کە لەسەرووی کەشتیەکانەوە بوو ئامادەی هەر ئەگەرێك بوون، دواتر بەهۆی گۆڕانی باوە زۆرێك لەو بەلامانە رووی خۆیان گۆڕی خۆیان لەنزیك کردەوە لە دوورگەی قشم، هاوکات زریان وبایەکان زۆر توند تر بوو، ئێمەش دەمانویست بەخێرایی بڕۆین نەوەك دووبارە تووشی دوژمنەکانمان ببینەوە ودواتر خۆمان لە کەنارەکان بشارینەوە، بەلاّم زریان وبا زۆر زۆر توندتر بوو، لەو کاتەدا یەکێك لە کەشتیە عەرەبیەکان نزیکمان بۆوە، کەچی لەناکاو خۆی بەکەشتیەکەی ئێمە داد ولای پێشەوەی کەشتیەکە وێران بوو، دواتر تا بەیانی بینمان ئەو کەشتیە دەسووتا، بەیانی کە چاومان کردەوە پاشماوەی ئەو کەشتیە هیچی نەمابوو.

لەرۆژی یەکەمی حوزەیراندا زریان وباوبۆرانێکی توند بەرەو روومان هات، بۆیە لە پێنجەم رۆژدا چووینە ناو ئاوی بوشەهر، ئەمەو شاری بوشەهر دەکەوێتە لای

رۆژهەلاتەوە، هاوکات کابتن داوای لێکردین بەخێرایی دابەزینە سەر کەنار، تاوەکو شێخی ئەو شارە رێگەمان پێ بدا ویەکێك لە دەریاوانێکمان بۆ دابێن بکات تا بچینە دوورگەی (کرك)، تێچووی ئەمەش دووسەد رووپیە بوو، لەلایەکی دیکەوە لە ئاوی بوشەهردا بەلەمێکی چارۆگەدرای ئینگلیزیمان بەناوی (بازین) بینی، کە کابتن (تۆرین) خاوەنیەتی، ئەمەو حکومەتی بۆمبای بەکرێی گرتووە تا کەلوپەل وشتومەکی بۆ بەسرا دەهێنا، هاوکات کابتن تۆرین پێی راگەیاندین کە پێش سێ هەفتە لەپێش ئێوەوە بەرەو ئێرە هاتووە ولەرێگەدا ولەنزیك دوورگەی قشم بیست ودوو بەلەم گەمارۆیان داوە، دوو رۆژیش لەژێر دەستی ئەو رفێنەرانە بووە، چەندین تەقەیان بەسەردا کردووە وچەندین کەلوپەلیان تالآنکردووە، لەلایەکی دیکەوە ئازادیان کردین دوای ئەوەی زانیان ئەو کەشتیە مولکی کۆمپانیای هیندی رۆژهەلاتی ئینگلیزیە و بەبوونی یەکێك لەکەسەکانی نێو کەشتیەکە کە برای (نبوب ماصولا باتنام)ە، کە یەکێکە لە میرە مووسلمانەکانی هیندستان.

عەرەبەکان بەکابتنیان گوت کە ئەوان لەحالەتی جەنگدان لەگەلّ ئیمامی مەسقەت و وایان زانی ئەو کەشتیە کەشتی (**نجمة الصباح**)، کە خاوەنەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئیمامی مەسقەت، هەر ئەو بەلەمانەش پێش دوو سالّ دەستیان بەسەر کەشتیەکی فەرەنسیدا گرت، لەشی حوزەیراندا لە دوورگەی کرك رەت بووین، کە دووریەکەی سێ میل بوو، کە دەوری بە چەندین بەردی گەورەی سپی درابوو، لەویدا ئاوەکە زۆر شێلو بوو وبۆیە کەشتیەکەمان راوەستا وگیر بوو، زۆر هەولّماندا تا کەشتیەکەمان رزگار بێ، لەمەوە داوامان لەیەکێك لە دەریاوانە عەرەبەکان کرد تا داوا لە شێخی ناوچەکە بکات ویارمەتیمان بدات، دواتر شێخ سلێمان بەخۆی وسەد پیاو وشەش بەلەم بەهانامانەوە هاتن، ئەمەو هەندێك لەو کەلوپەلانەی لەنێو کەشتیەکەمان دابوو دامانبەزاند، بەلآم بێ سوود بوو کەشتیەکەمان لەشوێنی خۆی نەجوولا، شەومان بەسەردا هات وپیاوانی شێخیش لەگەلّماندا مانەوە، هاوکات لە رۆژی هەشتەم بایەك هەلّیکرد وئاوەکە کەمێك بەرز بۆوە، ئەمەش بووە هۆکارێك کەشتیەکەمان بەدەوری خۆیدا بسورێتەوە بەبێ ئەوەی هیچ زیانێکی هەبێ، دواتر نزیك بووینەوە لەشاری کرك ولەوێشدا

لەکەنارەکە وەستاین، من وکابتن رید سواری بەلەمێك بووین تا بمانگەیەنێتە سەر کەنار، بۆئەوەی دەست بەسەر چەندین مانگای درِەندە دابگرین کە لەو دوورگەیەدا بەشێوەیەکی بەرچاو بوونیان هەبوو، پاش ئەوەی شێخ رێگەی پێداین، دوو رێبەری عەرەبمان لەگەڵدا هات وزۆری نەبرد بیست مانگای درِەندەمان بینی، ئەو ئاژەڵانە رەنگیان خۆڵەمێشی بوو، گەورەیان وەك بزنێك بوون، بەڵام قاچەکانی دریژتر وئەستوور تر بوو وشاخەکانی کورتر بوو، دوتر چووینە بەررزترین شوێن لەو دوورگەیەدا، کە پێدەچوو ئەو شوێنە بەرزە بەهۆی تەقینەوەی گرکانەوە بوو بێ، چونکە بەردەکانی هەمووی مەرجانی بوو وسەدەفە دەریایەکان ئەو ناوەیان تەنی بوو، هەر لەو دوورگەیەدا ئاوی خواردنەوە هەیە، بەڵام کشتوکاڵ زۆر بەکەمی تیایدا دەکرێ، هاوکات لەو دوورگەیەدا چەندین کانی بەرچاو دەکەوێ، کاتێك کە نیوەڕۆ داهات، تێبینی ئەوەم کرد کە پلەی گەرما هێدی هێدی بەرز دەبێتەوە، هاوکات زۆر گەرمتر بوو لەو شوێنانەی کە لەهیندستاندا تیایدا نیشتەجێ بوو بووم، لەکاتی گەرِانەوەمان بۆ لای کەشتیەکەمان وکەنارەکە، بینیمان شێخ سلێمان ئەو پانزدە گونیە برنجەی دابەش دەکرد، کە لەبرِی ماندوو بوونەکەی وەری گرتبوو کاتێك کە یارمەتی ئێمەی دا، دیار بوو ئەو بەو پاداشتە زۆر رازی بوو، بەڵام لەلای ئێمەدا شتێکی ئەوەندە زۆر نەبوو، چونکە شێخ سلێمان وپیاوانی یارمەتییەکی زۆری ئێمەیان دا تا کەشتی وکەلوپەلەکانمان رزگار بکەن.

ئەو شێخە تەمەنی خۆی لەپەنجاساڵە دەدا خوێندن ونووسینی نەدەزانی، تەنهاش داوای ئەوەی کرد چەند گولەیەکی پێبدەین ئێمەش هەندێکمان پێ بەخشی لەگەڵ هەندێك باروود دا، لەلایەکی دیکەوە درێژی دوورگەی کرك دوانزدە میل وپانیەکەی دە میل بوو، ژمارەی دانیشتووانیشی لەنێوان شەش سەد تا حەفسەد کەس دەبوو، ئەو دوورگەیە بە بەخێو کردنی بزن بەناوبانگ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا مانگایەکی زۆری لێ بوو، لەو دوورگەیەشدا هیچ ئاژەڵێکی درِەندە بەرچاو نەدەکەوت، بەڵام لەنێو ئاوەکەیدا مراوی وکیسەڵ هەبوو، ئەمەو ئەو دوورگەیە بەشێکی زۆر کەم سەوزەی بەرهەم دەهێنا، چونکە گەرمای هاوین هەموو بەربوومە کشتوکاڵییەکانی دەسووتاند، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو گەنم وجۆ وبرنجەی کە

دەیان چاند بەشی خەڵکی نەدەکرد، بەڵام ماسی خواردنی سەرەکی دانیشتووانی ئەو دوورگەیە بوو.

لەکاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆی رۆژی هەشتی حوزەیران یەکێك لەدەریاوانەکان بەناوی (زەیدوون) بەبەلەمەکەیەوە بەپێشمان کەوت تا بەنێوەندی دوورگەی کرخا وکەناری ئێرانیدا بڕۆین، زەیدوونی دەریاوان لەپێش کەشتیەکەی ئێمەدا دەڕۆیشت تاوەکو ئەو شوێنەنامان نیشان بدا کە بەردی تیایە تا دووربکەوینەوە، تا رۆژی یانزدەهەمی حوزەیران لەگەڵمان بوو تاوەکو گەیشتینە نزیك ئاوەکانی بەسرا،

لەکاتژمێر نۆی بەیانی رۆژی دوانزدەی حوزەیران من وکاپتن بەرەو لای کەناری عەرەبیەوە هەنگاومان نا، هەردووکمان تفەنگەکانمان بەشانەوە بوو، کەچی تەنها چەند کۆترێکی کێویمان راوکرد، دواتر لەیەکێك لەعەرەبەکان هەندێك هێلکە وسەوزەمان کڕی وهەروا گۆلکێمان بەشەش قروش کڕی، رێگەمان بەنێو دارخوماریەکاندا بڕی، ئەمەو دارخورما نێرەکان لە باکووری رۆژئاواوە دارخورما مێینەکان چاندرابوو، چونکە با زۆر جار لەو خاڵەوە هەڵی دەکرد، پاش دوای ئەوەی بە باخچەکانی دارخورمادا تێپەڕین گەیشتینە چەند گوندێك کە لەسەرەتای بیاباندا بوو، لە پشت ئەو گوندەش هیچ شوێنەوارێکی کشتووکاڵی ورواندن نابیندرێ، ئەو بیابانە وشکە لەسەرەتاوە چینێکی خوێ لەسەریدایە، کە بەسەریدا دەڕۆیی گوێت لەدەنگی پێیەکانت دەبێ کە لەژێر پێتا خوێیەکە جیڕە جیڕی دێ، ئەوەی سەیرە لەو وڵاتەدا بەهیچ شێوەیەك لەهەر شوێنێکی بیابان یان لە کەناری زێیەکان یان لەناوەڕاستی زێیەکاندا بی نازانی پلەی گەرما دەگاتە چەند ولەچ کاتێکدا دادەبەزێ، لەو کاتەشدا پێی هاوولاتییەکی ئەورووپی وەك ئەوەی ئاگری گرتبێ وایە، هەردەمیش ئەستوورترین پێڵاویش لەپێ دەکەن.

ئەوەی تێبینی دەکرێ هەموو خانووی گوندەکان بەگەڵای دارخورماکان لەگەڵ هەندێك لەقوڕ دورستکراوون، رێژەی دانیشتووانیش لەوێدا گەلێك زۆرە وزۆربەیان چاویان کزە، ئەمەش بەهۆی تیژی تیشکی هەتاوە، هاوکات جلوبەرگەکانیان زۆر ساکارە وپیاوان جلێکی بەرین لەبەر دەکەن وجامانەیەك لەسەر دەکەن تاوەکو لەتوندی گەرما بیان پارێزی، ئەوە جگە لەوەی ئافرەتانیش جلوبەرگی ساکار

دەپۆشن کە خۆی زیاتر لە قوماشێکی پەمۆیی شین دەبینێتەوە، خەڵکی ئەو گوندانە چەندین مەڕ ومالاتیان هەیە کە بەیانیان بەرەو کەنار دەیبەن کە لەوێدا لەوەڕ بەدەست دەکەوێ، ژیان وپیاوان بەیەکەوە چاودێری ئەو مەڕ ومالاتانە دەکەن، هەروەها بۆ هەر عەرەبێك رۆژانە چەندین جار لەئاوی زێدا خۆی بشوا، لەلایەکی دیکەوە لەگەڵ رۆژئاوا بووەوندا هەموو مەڕ ومالاتەکانیان دەگەڕاندەوە، هاوکات هەموو گوندێك بەدیوارێکی بەقوڕ چێندراو دەوری گوند درابوو، ئەمەش بۆ رێگە گرتن لەهەموو دڕندەکان بەتایبەتیش شێر کە لەو ناوچەیەدا بە زۆری دەبیندرێ.

ئافرەتانی عەرەبی وا دوورە پەرێز نین کە ئێمە وا پێشبینیمان دەکرد، چونکە دەمان بینی زۆربەی ئافرەتەکان بەرەنگاورەنگی جلوبەرگەکانیان نان وماستیان پێشکەش دەکردین، ئەو نانەی کە پێیان دەداین پارچە پارچە بوون هەروا ماستەکەش پەیت نەبوو بوو، وەك هەر کاتێك ئەورووپیەك سەیری دەرکرد، چونکە زۆر ترش بوو، بەڵام عەرەبەکان ئەو جۆرە ماستەیان زۆر لا خۆش بوو، ئەوە جگە لەوەی کاتێك بەسەر کەنار ولەنێو باخچە وگوندەکاندا تێپەڕ دەبووین چەندین دیمەنی دڵگیرمان بینی، بەڵام دەنگی کەشتیەکەمان وای کرد بەزوویی وبەخێرایی بگەڕێینەوە، هەروا لەلای ئێرانەوە پاشماوە وکاولکاری شارێکمان بینی کە بەدرێژایی دوانزدە میل لەسەر کەناری زێیەکەوە بوو، ئەو کات پێیان گوتین ئەو شارە لەلایەن نادر شاوە بەتەواوی رووخێندراوە وهەردەم گورگەکانیش لەنێو ئەو شارە کاول بووەدا هەبوو، ئەوە جگە لەوەی بەدرێژایی وپانی شارەکە بەشێوەیەکی زۆر کەم کشتوکاڵمان بینی، هەروا ژمارەی دانیشتووانەکەشی زۆر کەم بوو ولەلایەکی دیکەوەش چەندین دارخورما لێرە ولەوێدا هەبوو، ئەمەش واکردووە کەمێك قەسپ وخورما دەست بکەوێ.

کاتژمێر دووی پاش نیوە شەوی سێزدەی حوزەیران دووبارە کەشتیەکەمان هەنگاوی نا بایەکی خۆش لەلای باکوری رۆژئاواوە دەهات دوای ئەوەی پێنج میلمان بڕی، دووبارە کاتژمێر پێنجی بەیانی راوەستاینەوە، هاوکات دووبارە چەندین رانە مەڕم ومالاتمان بینی، لەگەڵ چەندین ئەسپ وئەسپ سواردا، ئەوەی

زانراوه زۆرێك لەشێخەكانی عەرەب چەندین ئەسپیان هەیە، دیارە ئەو ئەسپانەش گیا وگیالۆك دەخۆن كە لەسەر كەنارەكەدا رواوە، دوای ئەوەی شەپۆلەكان بەتیژی لەكەناری دەدا تەنها ئەوەمان پێكرا بەزووترین كات خۆمان بگەینینە بەسرا، هاوكات كاپتن (سبنس) یەكێك لەرێبوارانی نێو كەشتیەكەی نارده لای كۆمپانیا وپێی رابگەیەنێت كە ئێمە گەیشتووین، باخچە وكشتووكاڵ لەلای عەرەبەكانەوە كەمێك باشتر بوو لەلای ئێرانەوە ودیمەنەكە كەمێك جوانتر بوو، لەوێدا چەندین جۆر سەوزەمان بینی، لەكاتی ئێوارەشدا یەكێك لەهۆزەكانمان بینی بار وبارگەیان تێك دەنا وئەو شوێنەیان لا خۆش نەبوو، چونكە ئەوان لەشوێنێكی دیاری كراوە نەیان دەویست سەقامگیر بن، بۆیە تا شەو كۆتایی هات پیاوانی ئەو هۆزە تەقایان بە ئاسمانەوە دەكرد، لەلای بەری عەرەبیەوە كاتێك سەیری لای ئێرانت دەكرد كەمێك دیمەنە گونجاوتر بوو وەك لەوەی پێشتر، چونكە چەندین گوند وباخچەی وبێستان لەو شوێنەدا هەبوو، هاوكات لەلای عەرەبەكانەوە كشتووكاڵ و سەوزایی كەمێك لە كەنارەوە دوور بوو، چونكە زەوی لەوێدا پێویستی بەكیمیا هەبوو، عەرەبەكانیش زۆر بەكەمی كیمیا بۆ زەوی بەكار دەهێنن، هەروا لەلای ئێرانەوە ئەوەت دەبینی كە خانووەكان زۆر بەگونجاوی وبەپتەوی دورست كرابوو، ئەوە جگە لەوەی جلوبەرگەكانیان هەندێك لەجلی عەرەبیەوە نزیك بوو، ئافرەت لەوێدا تەنها جلوبەرگێكی شینیان نەدەپۆشی، لەگەڵ ئەوەی منداڵەكانیان رووت وقووت بوون، بەڵام پیاوانیان زۆر توند دیار بوون ودەستیان بەسەر هەموو ئەوشتانە دادەگرت كە بیان ویتستبایە، كەشتیەكەمان زۆر بە هێدی هەنگاوی دەنا ئەمەش بەهۆی كزی باكەوە، لەم كاتەدا هەندێك لە كۆمەڵە عەرەبیەكان بەرەو roومان بوونەوە ئەمەش وایكرد سێ میل لێیان دوور بكەوینەوە، ئەو ناوچەیە دار ودرخت ودارخورماریەكی زۆری لێ بوو، هەروا چەندین بێستانی بەربووم وسەوزەمان بینی هەندێكیان لەجۆری ئەوروپی بوون وەك ترێ و پورتەقال وهەنار ولیمۆن وزۆرێك لە بەربوومەكان، هەروا چەندین جۆرمان لە سێو بینی كە تامێكی زۆر خۆشی هەبوو كە ناویان لێ نابوو (كودلنغ) كە زۆر خۆشترە لەوانەی لە ئینگلترا خواردوومانە، من زۆر دڵخۆش بووم بەم گەشتەم، لەگەڵ ئەوەی لەماوەی پێشوودا لە دوورگەی

سیلان بوومە وزۆر پیاسەم بەناو هەرێمی ترافنکۆر کردووە ولەبەندەرەکانی کەناری ملباریش زۆر وەستاوم، بەڵام من ئەم شوێنەم پێ خۆشتر بوو، چونکە لێرەدا گەلێك زۆر لە سەوزە وبەربوومم بینی وەك لیمۆ وپورتەقاڵ، کە لەژێر سێبەری دارخورمادا چەندین بۆن وبەرامی هەیە، ئەوە جگە لەوەی دانیشتووانی ئەم ناوچەیە زۆر رێزدارن وهەمیشە هاوکاریان دەکرین بۆ ئەوەی رێنوینمان بکەن وبۆ رێگە وشوێنە راستەقینەکان، هەروا لە نێو کەشتیەکەمان سوودێکی زۆرمان لەو عەرەبانە بینی، بەتایبەتی لە شارەزابوونی ناوچەکان.

لەکاتژمێر پێنجی بەیانی رۆژی هەژدەیەمی حوزەیران پاش ئەوەی هەنگاومان نا، بەهاوکاری رێبەرێکی عەرەب لەکاتژمێر سێ ونیوی دوای نیوەڕۆ بەرەو بەسرا هەنگاومان نا، لەرێگەدا گەلێك جار سەربازەکان رێگەیان لێ دەگرتین، بەڵام رێبەرەکەمان هەردەم هەموو لایەکی رازی دەکرد، هاوکات زۆرێك لەخەڵك بەسەرسوڕمانەوە سەیری ئێمەیان دەکرد، پێدەچوو تا ئەو کاتە هیچ ئەوروپییەکیان نەبینی بێ، هەورا ئەو رێگەیەی ئێمە پێیدا تێپەڕین، پێشتر هیچ گەڕیدە وگەشتیارێك بەویدا تێپەڕ نەبوو، کاتێك لەنێو کەشتیەکەدا بووین وبە گوندەکاندا تێپەڕ دەبووین دیمەنێکی ئێکجار دڵگیر بوو، کێڵگەکانی گەنم وجۆ وبرنج سەرەتای گەشانەوەیان بوو وئەوە جگە لە کێڵگەکانی بەروبووم وسەوزە کە بۆ شاری بەسرا دابین دەکرا، ئەمەو تورك وعەرەب زۆر لەو پیداویستیانەیان لە لا گرنگە، پاش ئەوەی زیاتر لە دە میلمان بڕی وکاتژمێر شەش ونیوی ئێوارە بوو گەیشتینە کارگەیەکی ئینگلیزی لە بەسرا، لەوێدا ئەسپێك ورێبەرێکیان بۆم دابین کرد وراستەوخۆش بەرەو (ماریکل)ی بنکەی سەرەکی دیهاتەکانی مستەر (سمۆیل مانستی) بەریتانی نیشتەجێ، ئەو شوێنەش لە دووری سێ میل بوو لە بەسرا وشوێنەکەش لەسەر کەناری زێیەکەدا بوو، لە مارکێلدا بۆ ماوەی هەفتەیەك مامەوە لەوێدا پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردم تا ئەو کاتەی لەوێدا بووم، مستەر مانستی پۆستی نیشتەجێی بەریتانی وەرگرتبوو ئەو کەسێکی زۆر بەڕێز بوو وحەزت دەکرد بیناسی، خزمەتێکی گەورەی حکومەتەکەی کردبوو وبەتایبەتیش دەستگیرکردنی نێردراوەکانی فەڕەنسی وقەدەغە کردنی ئەو نێردراوانە تاوەکو بەهیچ شێوەیەك پەیوەندی بەهیندستانەوە نەکەن بەتایبەتیش لە رێگەی وشکانیەوە.

لەکاتی مانەوەم لەوێدا چەندین جار سەردانی بەسرام کرد، هاوکات شاری بەسرا شارێکی زۆر فراوانە وچەندین بازاڕ وبازاڕگەی تیادا دەبیندرێ وچڕی دانیشتووانیش لەوێدا زۆر بەرزە وبەهەموو شێوەیەك ئەو بازاڕانە هەموو شتێکت

تیادا بەدەست دەکەوت وەك هەموو جۆرە دەرمانێکی لێ هەبوو وبەنرخێکی هەرزان وەك چۆن لە ئەورووپا بەهەمان نرخە، هەروا لەویدا دراوی کاغەز بەهایەکی هەبوو، کەچی لەزۆرێك لە وڵاتان ئەو بەهایەی نەبوو، لەلایەکی دیکەوە زۆربەی قوماش ودورستکراوە ئینگلیزیەکان لەوێدا بەدەست دەکەوت، بەڵام زۆربەی شتەکان نرخەکانی دوو ئەوەندەی ئەو نرخانە بوو کە ئینگتەرادا هەیە.

درێژی دیواری شارەکە لە سەر کەناری زێیەکەوە تا بیابانی گەورە نزیکەی چوار میلە ولە باکوورەوە تا باشوور درێژیەکەی سێ میلە وئەمەو ئەم دیوارە لە قوڕ ولم دورستکراوە وخۆی راناگرێ بەرامبەر تۆپی دوور هاوێژ، لەلایەکی دیکەوە زۆرێك لەو تۆپە دوور هاوێژانەم بینی کە لەنێو شار وگوندەکاندا هەن، هەموویان لە برنز دورستکراون، بەڵام من تەنها دوو تا شێ لەو تۆپە دوورهاوێانەم بینی کە بەکەڵك کار کردن بین، زۆربەی ئامێرەکانیشی تێك چووە، ئەمەش بەهۆی توندی وتیژی گەرمای هاوین، هاوکات لەنێو شاردا چەندین مزگەوت وشوێنی نوێژ کردن دورست کراوە و وێنەیەکی زۆر جوانی داوەتە ئەو شارە، چونکە زۆربەی مزگەوتەکان بەشێوەیەکی زۆر جوان دوەرستکراوە وچەندین نەخش ونیگاری لەسەر هەیە، هەروا زۆربەی مزگەوت وگەرماوەکان وشوێنە گشتیەکان هەمووی بەکەرپووچ دورستکراوە، بەڵام بینای کارگەی ئینگلیزی لەهەموو باڵەخانەکان باشتر وجوانترە لەو شارەدا، هەر لە نێوەندی دیوارەکەدا واتە لەنێو شاردا چەندین شوێنی بۆشایی هەیە، کە لەوانەیە ئەو شوێنانە رووبەڕووی سووتان ورووخان بۆتەوە، چونکە زۆربەی خانووەکان لەوێدا بە قوڕ دورستکراوە، یاخود بە گەڵای داری دارخورماکان، کە هەر هەموویان لەو بێستانە هێناوە کە لەدەوربەری خۆیدایە وتەمەنی هەموو خانووەکانیش درێژ نابێ، چونکە زۆربەی دارەکان بەپێی رۆژ ورۆژگار دارەکان دەپووکێتەوە وخانووەکە یاخود کەپرەکان بەسەر یەکدا دەڕووخێ، سەربانی خانووەکانیش نزمن وبەخانووەکانی تەنیشتیەوە نووساوە، بەڵام سەربانەکان پتەون، چونکە زۆربەی خەڵك لەهاویناندا لەسەربانەکان دەخەون، لەلایەکی دیکەوە لەلایەن هەر کەسێکی ئەورووپی کاتێك ئەو خانووانە دەبینی وا دەزانێ ئەم خانووانە زیندانە، چونکە بەشێوەیەکی چوار گۆشەیەی دورستکراوە

ولەچەند ژوورێك پێك دێ وژووكیان لەژێر زەویە وكاتێك زۆر گەرمایان دەبێ پەنا دەبەنە بەر ئەو ژوورەی ژێر زەوی وبەهیچ جۆرێك ئەو خانووانە پەیوەندی بەهاوسێیەكانیەوە نییە، بەڵام ناندین وئاو و ئەسپەكان لەحەسارێكدان، بەڵام هۆڵی ناوخانووەكە تەنها بۆ پێشوازی كردنی میوانەكانە، ژنان وكچانیش گەلێك جار لە نهۆمی دووەمی خانووەكەیە تەنهاش ئەندامانی ئەو خێزانە دەتوانن بچنە ئەو ژوورانە، زۆر بەكەمیش ژنانی چینی بەرز لەدەرەوە دەبینی، كاتێكیش دەچنە دەرەوە سەرپۆشیان لەسەرە، بەڵام زۆربەی ئافرەتانی عەرەب وئەوانەی لەچینەكانی دیكەن وەك چینی گشتی سەرپۆش بەكار ناهێنن.

لەلایەكی دیكەوە كۆیلەكان ئینجا چ ئافرەت بن یاخود پیاو زۆر بە ئاشكرا لە بازاڕدا كڕین وفرۆشتنیان پێ دەكرێ.

وەك لە پێشتردا باسمان كرد شاری بەسرا شارێكە چڕی دانیشتووانی پێوە دیارە، زۆربەی دانیشتووانەكەش عەرەبن، بەڵام بەشێكی كەمی تورك وئەرمەن، زۆربەی توركەكانیش لە سوپادا كار دەكەن یان لە پۆستەكانی حكومەتدان، بەڵام ئەرمەنەكان زۆربەیان لە بازرگانیدا كار دەكەن وكەسانی زۆر بەڕێزن، ئەوان لە بازرگانیدا دەستێكی باڵایان هەیە هەر لە ڕۆژهەڵاتی ئەندیز وبەنگال، لەو بازرگانیەدا چەنیدین كەشتی بەكار دەهێنن كە هەر یەكێكیان چوار سەد تەن كەلوپەل هەڵدەگرێ، وەك باویش كەشتیە بار هەڵگرەكان لە بەسراوە بۆ بۆمبای یان بەنگال بارەكانیان زیاتر ئاسنە بەهەموو جۆرەكانیەوە یاخود باری دەرمان وسەوزە وبەروبووم، لەهەمووی سەیرتر زۆربەی ئەو كەشتیانەی بەرەو هێندستان دەڕۆن زۆر جار ئەسپە عەرەبیەكان یەكێك لەبارەكانیان بووە، هەروا چەندین نموونەی دیكەمان هەیە سەبارەت بەو كەشتیانەی كە زیوو وسەبایكەكان هەڵدەگرن كە بەهایان زیاتر لە هەزاران روپییەیە، ئەو دراوانەش زیاتر دۆلاری ئیسپانی وجونەیهی ڤێنیسایە، زۆربەی هەرە زۆری كەرەستەكان لە ئیپمراتۆریەتی توركی لەلایەن ئەرمەنەكانەوە بەڕێوە دەبرا، چونكە ئەرمەنەكان پارەیەكی زۆر سەرمایەیانە وبۆیە دەیانویست ئەو بازرگانیە نەكەوێتە دەست توركەكان وهۆكاری سەرەكیش لەو بازرگانیە دوانزدە لەسەدا سوودیان لەهەر بار وكەلوپەلێك

وەردەگرت، زۆربەی بارەکانیش بۆ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە شەکر وبرنج پێکهاتبوو کە لەهیندستانەوە بۆیان دەهات، هەروا ئەرمەنەکان. زۆربەی دراوە زێڕەکانیان بۆ هەموو لایەکی ئیمپراتۆریەت دەنارد، ئەمەش بەهاوکاری تەتەرەوە بوو کە زۆربەیان لە ئەنازۆل دەژین، لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دەست وپێوەندی حکومەت بوون کە لەتەك کارەکانیان پاداشتی خۆیان وەردەگرت، زۆرجاریش تەتەرەکان رووبەڕووی تالاّن وبڕۆ دەبوونەوە کە زۆربەی کەلوپەلەکان سەر بە ئیمپراتۆریەت بوون، مانگێك پێش ئێستاش رووداوێکی وا قەوما، کاتێك یەکێك لەتەتەرەکان لە ئەستانەوە بۆ بەغدا دەگەڕایەوە، ئەو شەش سەد جونەیهی ڤینیسی هەڵگرتبوو ورووبەڕووی هێرش بۆوە ئەو پارەیەی پێی بوو لێیان سەند ولەنێوان دیار بەکر وموسڵیش رێگەکەی لێ ون بوو.

وەك لەسەرەتادا باسمان لێوە کرد شاری بەسرا زۆربەی عەرەبن وخەڵکەکەی بەگشتی هەژارن وژمارەی دەوڵەمەندەکانیشیان بە پەنجەی دەست دەژمێردرێ، هەژاران لەو شارەدا کارەکانیان زۆر ئەستەم وناخۆشە، بەو کریەی لەبڕی کارەکانیان وەری دەرگرن زۆر کەمە وئەو خەڵکە هەژارەش تەنهاش خورما ونان خواردنیانە، لەگەڵ ئەوەی خواردنەکانیان زۆر سادەیە، بەڵام هێزی لەشیان دوو ئەوەندەی هێزی ئەورووپیەکانە، هەروەها دەتوانن رووبەڕووی ناخۆشیەکان ببنەوە، شەقامەکانی شاری بەسرا زۆر تەسکن لە زۆر شوێندا تەنها شوێنی ئەسپێکی لێ دەبێتەوە تاوەکو پێیدا تێپەڕێ، زۆربەی رێگەکانیش رێك نەخراوە بۆیە ئەسپ وگالیسکەکان رووبەڕووی ناخۆشی دەبوونەوە، لەلایەکی دیکەوە لەنێو شاری بەسرادا کڵێسایەکی کاسۆلێکی رۆمانی تیادایە، خەڵکیش لەو ناوچەیەدا زۆر بەکەمی کردەوەی لابەلا رووبەڕووی بیانیەکان دەکەنەوە، هەروا ئەوانەی کە پیاوانی شارەوانین وپۆشاکی شارەوانی دەپۆشن زۆر گرنگی بە سمێڵەکانیان دەدەن، لەوێدا چاوم کەوت بە یەکێك لە ئەرمەنیە ناسراوەکان بەناوی (جۆزیف ئەمین) کە چەندین ساڵ لە ئینگلتەرا ژیاوە، لەویدا پەرتووکێکی نووسیوە سەبارەت بەو گەشتانەی کە بۆ ئینگلتەرا کردوویەتی، باسی لەوە دەکرد کە کوڕەکەی لەگەڵ خۆیدا بیباتە بەنگال، بەڵام من پێم گوت کە کوڕەکەی لەگەڵمدا بنێرێتە ئینگلتەرا

وەك وەرگێڕێك، چونكە ئەو لە زمانەكانی ئەرمەنی وعەربی وتوركی وئینگلیزی تێدەگا، كوڕەكەی تەمەنی حەڤدە ساڵان بوو، زۆری حەز دەكرد لەگەڵمدا وەك ڕێبەرێك بێ، بەڵام باوكی جەختی لەوە دەكردەوە كە كوڕەكەی لەگەڵ خۆیدا بباتە بەنگال.

**یەك شەممەی ٢٥ی حوزەیران**

هەموو شتەكان بەپێی ڕێنوینەكانی مستەر مانستی بوو بۆ ئەوەی لە بەسراوە بەرەو بەغدا بڕۆین، هەروا یەكێك لە عەرەبەكانیان لەگەڵم دانا وەك یاوەرێكی ڕێگا، ئەو پیاوە ناوی (عەبدولەتیف) بوو تا بڵێیت پیاوێكی بەڕێز بوو، یاوەری ئەویش لە بری هەزار وسێ سەد قڕۆش بوو، ئەم بڕە پارەیەش بۆ بەكرێ گرتنی سێ بەلەم وچەندین پاسەوان دەبوو، بەڵام ئێمە خۆمان ئەركی هەڵگرتنی هەموو قاپ وشووشە و خەزەفیەكانمان خستە ئەستۆی خۆمان، بۆ ئەمەش توانیمان هەر یەكەو پێنجسەد قڕوش بگەڕێنینەوە، لەلایەكی دیكەوە ئەو پۆشاكەی كە بۆمان دانرابوو پێكهاتبوو لە:

**١- عەبایەكی عەرەبی كە لەسووف دورستكرابوو.**
**٢- پۆشاكی ژێرەوە.**
**٣- جووتێك لە شەرواڵ.**
**٤- كراسێك.**
**٥- (زەبون) .**
**٦- عەمامەیەك.**
**٧- جامانەیەك لە سووف.**
**٨- جووتێك لە نەعل كە ڕەنگەكەی زەرد بوو.**

بەلەمەكانمان ڕاكێشا بەرەو ماركیل، كاتژمێر پێنج بە مستەر مانستیمان گوت ئێمە دەڕۆین، دوو لە بەلەمەكان ئێمە لەناوی دابووین وئەوانی دیكەش پاسەوانەكان بوو، كاتێك كەرێگەمان بری یەكسەر جلەكانی خۆمان گۆڕی، كەكە

جلەکانمان گۆڕی زۆر لەعەرەبەکان دەچووین، ئێمەش سمێڵکی گەورەمان هەبوو، چونکە کاتێك لەهیندستانەوە بەڕێ کەوتین نەمان تاشی بوو.

ئێمە زۆر گرنگیمان بەدڵنیایی وسەقامگیر دۆخی خۆمان دەدا، لەمەوەش عەبدولەتیفی یاوەرمان لەیەکێك لەبەلەمەکان چاودیری ڕێگەکەی دەکرد، هەروا برایەکەی بەناوی (حمود صلای) لەتەك خۆیەوە ولەبەلەمێکی دیکەدا ئەو کارەی پێ سپێرابوو، هەروا ئەو بەلەمانەی کە ئێمەی دەبرد بەشێوەیەکی گونجاو دورستکرا بوو، بۆیە ئەو بڕە پارەیەی کە ئێمە پێمان بەخشی زۆر نەبوو پەسەند نەبوو.

ئەم بەلەمەش لەلای ئەوەاندا ناوی (دۆنیك) بوو کە ئێستاش لەباشووری عێراق ولە زۆنگاوەکاندا ئەو ناوەیان لێ ناوە، هەندێك جاریش پێی دەڵێن (کرافە) ئەم بەلەمانەش لەلایەن عەرەبەکانەوە لەئاوی دیجلە وفوراتدا بەکاری دەهێنن، پانی بەلەمەکەش حەفت تا نۆ پێیە، درێژیەکەشی چل ودوو پێیە کە لەدار دورستکراوە ولەکاتی تێکچوون وکون بوونی زۆر بەئاسانی چاك دەکرێتەوە.

نێو بەلەمەکەش بەچەندین داری پتەو وئەستوور دارێژراوە تا بەهیچ شێوەیەك ئاو نەیەتە ژوورەوە، لەم ولەولاشی دوو داری دارێژ سەوڵ دانراوە تاوەکو بەهێز وباسك بتوانی بەلەمەکە بەرەو پێشەوە ببەی، هەروا هەر لەنێو بەلەمەکەدا چەند پارچە حەسیرێك دانراوە تاوەکو گەرم نەبێت، لەسەرەتای بەلەمەکەی ئێمەشدا ناندینێکیان بەکەرپووچ دورستکردبوو تا خواردنی تیادا ئامادە بکەن، ئەمەش سوودێکی زۆری هەبوو، چونکە ئەگەر خۆمان خواردنمان ئامادە نەکردبوایە ئەوا دەبوایە لەسەر کەنارێکەوە رابگرین وبچین خواردنی ئامادە کراو بخۆین، ئەمەش وایکرد لە گەشتەکەمان دوا نەکەوین، ئەوەی زانراوە ئەو بەلەمانە لە حیلەوە بەرەو بەسرا سێ رۆژی دەخایاند زۆربەکەمیش چوار رۆژی دەخایاند، بەڵام لەبەغداوە بۆ بەسرا لە زێی دیجلەدا ماوەکە کەمترە لە هەشت رۆژ، لەگەڵ ئەوەی ئاوی دیجلە لەهەندێك شوێندا زۆر خێراترە، بەڵام درێژی زێی دیجلە دووهەندی درێژی زێی فوراتە، لەگەڵ ئەوەی زۆرجاران بایەکی تیژ هەڵدەکا، دەتگەڕێنێتەوە بۆ کەناری سنووری ئیرانی، ئێمە کاتێك لەنێو بەلەمەکەدا بایەکی فێنك هەڵیکرد

وسەوڵەکانکمان دەستیان بەکار کرد، ئەمەو بەلەمەکە تەنها لە کاتژمێرێکدا توانی پێنج میل ببڕێ، کاتێك کەبەرەو باکووری بووینەوە کاتژمێر گەیشتە دوانزدە، لەکاتی رۆژهەڵاتندا ولەرۆژی بیست وشەشی مانگی حوزەیراندا، دوای ئەوەی سەوڵەکان دەستیان بەکار کردەوە بێگومان بەهێزوبازووی سەوڵ لێدەرەکان لەکاتژمێرێکدا سێ میل هەنگاومان دەنا، بۆ ئەوەی پشوویەك بدەین کەمێك لەناو زێیەکەوە ولەلای سنووری ئێرانی راوەستاین، ئەوەی سەیرە ولەلای عەرەبەکانەوە ولەباکووری مارکیل هیچ سەوزاییی وکشتوکاڵێك بەرچاو ناکەوێ، بەڵام لەکەناری زێیەکەدا چەندین حوشترمان بینی، ئەمەش بووە مایەی خۆشحاڵی بۆ ئێمە.

کەناری زێیەکەی ئێران دیمەنێکی زۆر جوان بەچاو دەبەخشێ، چونکە لەوێدا چەندین کێلگەی دارخورمای چڕ هەیە، هەورا لەدوورەوە چەندین گوندت بەرچاو دەکەوێ، پانی ئەو زێیە لەوێدا دوو میلە کە بەرەو باکووری رۆژئاوا وباشووری رۆژهەڵات دەڕوانێ.

کاتێکیش کە با هەڵیکرد ناچار بووین بەلەمەکانمان بە گوریس راکێشین، لەکاتژمێر یانزدەدا ئاوڕێژی ئەو زێیە گەورەیەمان لەلای ئێرانەوە بڕی کە لەوێدا ناوی (شەتی عەجەمە)، عەرەبەکانیش بەمە مەبەستیان لە زێی فارسە، لەگەڵ هیچ ناوەێکی دیکەیان لێ نەنابوو، چونکە پرسیارمان کرد کە ئایا ناوێکی دیکەی هەیە، لەکاتژمێر یەك گەیشتینە (قورنە) کە زێی دیجلە وفورات بەیەکتر دەبەستێتەوە، کاتژمێرێك لەوێدا ماینەوە وتێبینیم کرد کە زێی دیجلە دەکەوێتە لای باکوری رۆژهەڵات، فوراتیش دەکەوێتە لای رۆژئاواوە، لەو شوێنەدا کەشتیەکی گەورە هەبوو کە تەنها کاری راودوونانی ئەو کەشیانە بوو کە رایان دەکرد لە پێدانی ئەو ر سوومانەی کە لەسەریان بوو، هاوکات ئەو کەشتیە کاری پاسەوان کردن بوو تا لێنەگەڕێن کەشتیەکانی دی بەبێ پێدانی رسووم وگومرگ تێپەڕن، ئەمەو هەردوو زێی کاتێك بەیەکتر دەگەن رووبەرێکی گەورەی ئاوی پێك دێنن.

خەڵکی ئەو ناوچەیەش ناویان لەم شوێنە ناوە (شەتی عەرەب)، ئەمەش تا دەگاتە دوورگەی عەرەبی پێی دەڵێن شەتی عەرەب، شەپۆڵەکانیش لە قورنە هیچ

کاریگەریەکی ئەو تۆیان نییە تەنها لەو کاتانە نەبێ کە مانگ بەدەرەوەیە یاخود نزیك بۆتەوە، هەروا لەو رۆژ وکاتانەش ئاو زۆر بەرز نابێتەوە.

زۆرێك لەو کەسانەی کە نزیکن لەم بابەتە پێیانوایە کە قورنە شوێنی (بەهەشتەکانی عەدەن) بووە، وەك چۆن شاعیرێکی ئینگلیزی کوێر لەپەرتووکەکەیدا ناوی ناوە بەهەشتی ونبوو، ئەم ناوەش لەلایەن (ملتۆن)ەوە ناو لێنراوە بەهەشتی سەر زەوی، بەڵام ئەم وەسفە لەگەڵ کاتی ئێستادا لێکچوو نییە، چونکە تەنها گوندێکی بچووکە کە بەلم وقوڕاو دەور دراوە وچەندین خانووی تاك وتەرای تیادا دەبیندرێ، هەروا لەنێوان گوندەکە وزێیەکەدا تەنها بێستانێکی دارخورما دەبیندرێ کە بۆتە سێبەرێك بۆ ئەو ناوە، پێش دەچێ زۆربەی عەرەبەکان لێرەدا زۆربەی کاتەکانیان بەبێ ئیشی ببەنە سەر، تەنهاش بژێویان لەسەر ئەو کەسانەیە کە بێرەدا گەشت دەکەن، هەروا زۆر پشت بە کارەکانی خۆیان نابەستن.

لەلایەکی دیکەوە ئەفسەرەکانی گومرك پێشبینی ئەوەیان دەکرد رێبەرەکەمان دیاریەکی پێشکەش بکات، بەڵام رێبەرەکەمان هیچ دیارییەکی پێشکەش نەکرد، چونکە هیچ کەلوپەل وشمەکێمکمان هەڵنەگرتبوو، تا لەبری ئەو شتانە شتێکی پێشکەش بکەین.

لەکاتژمێر سێ قورنەمان بەجێ هێشت وبەرەو زێی فورات هەنگاومان نا، سەرەتا کەناری رۆژئاوامان بری، بەڵام لەناکاو بایەك لەلای رۆژهەڵاتەوە رووبەڕوومان بۆوە، ئێمەش ناچار بووین بەلەمەکانمان وسەوڵەکانمان بەخێرایی بگوازینەوە وتا تێکڕایی خێرایمان سێ میل بێ لەکاتژمێرێکدا، هاوکات گوندەکانی ئەو ناوچەیە زۆر بەکەمی ژیان تیادایە واتە خەڵك بەکەمی لەو دێهاتانە دەژین وتەنهاش زۆنگاو وزەلکاو دەبیندرێ، بۆیە بە تفەنگەکەم چەند گولەیەکم لە مەلی کوکوختی گرت، دوای تەقەکردنەکەم زۆری نەبرد مێگەلێك لە بەراز بەدیار کەوتن، کە قەبارەی هەندێکیان ئاسایی نەبوو، ئەوەی راستی بێ من ئەمەم پێ سەیر بوو، چونکە یەکەم جار بوو ئەو جۆرە ئاژەڵانە ببینم کە رەنگیان سوورێکی تۆخ بێ، لەلایەکی دیکەوە لە نزیك بەسرادا ژمارەیەك لەو بەرازانە کوژرابوون، کە تەرمی هەر یەکێکیان دە قەناتیری ئینگلیزی بوو.

دەبێ ئەوەش بڵێین عەرەبەکان گوشتی بەراز ناخۆن بۆیە تەرمی ئەو بەرازانە جێهێڵدرابوو، باسیشیان لەوە دەکرد بەراز هەتا بژی قەبارەی لەشی گەورەتر دەبێ، هاوکات گەورەیی لەشیان ئەو بۆچوونە پشت راست دەکاتەوە.

لەرۆژئاوابووندا چەندین رێوی مێنەمان دی، لەدوورەوە چاودێریمان دەکەن، بۆیە منیش تەقەم لەیەکێکیان کرد وکوشتم، لەو کاتەدا زیاتر سەوڵەکانمان لێدا وهەنگاومان نا تا کاتژمێر هەشتی شەو، دواتر لەتەك یەکێك لەمەزارەکان دانیشتین وپاڵماندواە، بەڵام هیچ پشوومان نەدا وخۆشیمان لەخۆمان نەبینی، چونکە تا بەیانی دەنگ و وەڕینی سەگ وریوو وگورك وچەندین جۆر لەو ئاژەڵانە وەڕسیان کردین ، لەمەوەش دیار بوو کە شوێنەکەمان زۆر ترسناك بوو.

کاتێك کە رۆژ بۆوە لە رۆژی سێشەممەی ٢٧ی حوزەیران دەستمان کردەوە بەگەشتەکەمان وبەلەمەکانمان راکێشایە نێو ئاوەکەوە، دێهاتەکان ئەگەر لێرەوە لێیان بنوارێ ئەوا دیمەنێکی زۆر جوان بەهەموو دەوروبەر دەبەخشێ وئەویش بەبوونی ئەو هەموو بێستانە وکێڵگەی دارخورماکان، لەکاتژمێر دوو بەتەك چەندین رەشماڵ نشینی تێپەڕین کە لەهەموو لایەکەوە مەڕومالآت دەوری رەشماڵەکانی دابوو، لەکاتژمێر سێدا بەرەو کەناڵی لای راستی زێیەکە شۆڕ بووینەوە کە بەرامبەرەکەی بیابانێکی وشك بوو، گەرمی خۆر لەو پەڕی دابوو زۆر گەرم بوو، دوای ئەوەی هەموو ئاژەڵ وگیاندارەکانی دەریا ماندوو بوو بوون وئینجا بۆنیان ئەو ناوەی پڕ کردبوو، ئەمەش هەموو لایەکی بێزار کردبوو، عەربەکان ناویان لەو کەناڵە نابوو (ئاوی مردن).

زۆرێك لە پیاوانی ئەو ناوچەیە دەیانویست بەهەر شێوەیەك بێ ئەو کەناڵە ببەستن ونەیەڵن ئاو بێتە دیوەکەی دی، بەڵام هەموو هەوڵەکانیان بێ سوود بوو، بەهیچ شێوەیەك نەیان دەتوانی ئەو کارە بکەن، بەڵام من لەو بڕوایە دابووم ئینگلیزەکان بەهۆی ئەو کەرستانەی کە لەژێر دەستیان دابوو دەیانتوانی لەماوەی چەند کاتژمێکدا ئەو کارە بکەن، کەچی پەنجا لە پیاوانی عەرەب بەماوەی هەفتەیەك ناتوانن ئەو کارە بکەن، کاتێك رۆژ بەرەو ئاوابوون

دەڕۆیشت بەلەمەکانمان بەرەو لای کەنارەکە راکێشا، تا ئەم شەو وەك شەوی رابردوو بتوانین کەمێك بحەسێینەوە و وەك شەوی رابردوو لەبەر وەڕینی سەگ وگورکەکان هەراسان بین.

**چوارشەممە ۲۸ی حوزەیران**

کاتێك کە رۆژ بۆوە دووبارە دەستمان بەگەشتەکەمان کردەوە وچەندین کەناڵمان بڕی، زۆربەی گوندەکان بەهۆی زۆری وبەرزی ئاوەوە نەیان دەتوانی گەنم بچێنن، دیسانەوە بەتەنیشت چەندین رەشماڵی عەرەبەکان تێپەڕ بووین کە لەهەموو لایەکەوە مەڕومالاَتەکان دەوری دابوو، کاتێك ئێوارە داهات گەیشتینە شارێکی گەورە کە دەکەوێتە لای راستی زێیەکە وناوی (سوق الشیوخ)ە لەویدا من و مستەر ستیفنتس وکاپتن رید چەند نێچیرێکی نێو زێمان کڕی، بینمان ئەو خواردنەی ناو زێ سوودێکی ئەو تۆی هەیە، چونکە چەند شەوێك بوو خەومان لێ نەدەکەوت، لەگەڵ ئەوەی ئێمە هەردەم لەم گەشتەمان لەسەر زەویەکی رووت پاڵمان دەدایەوە ودەنووستین، بەلاَم ئەمجارەیان زۆر بە ئیسراحەت خەومان لێ کەوت، ئەمەش پاش ئەوەی توانیمان هەموو ئەو مێش ومەگەزە پیسانەی کە لەدەورمان بوون دووریان خەینەوە، کاتێك کە گازی لێ دەگرتین ئەوەندە بە ئازار بوو دەبوایە چاومان لێك نەکەینەوە، نەوەك بێنە نێو چاومان.

**پێنجشەممە ٢٩ی حوزەیران**

بەدرێژایی ئەو رۆژە لە سوق شیوخ ماینەوە، ئەمەو هەندێك لەوانەی لەگەڵمان بوون لەگەڵ حەمود صلای بەشەڕ هاتن، یەکێك لەوانە بەهۆی یەکێك لەسەوڵەکان توانی لەسەری بدات، دواتر ئەو کەسە زۆر بەزەحمەت توانی لەژێر دەستی رزگاری بێت، دواتر ئێمە ورێبەرەکەمان ناچار بووین ئەو بەلەمە بەرێ بکەین وبەلەمێکی دیکە بەکرێ بگرین، ئەمەش کارێکی ئاسایی بوو هەموو کارەکانمان بسپێرین بە بەلەمێکی دیکە، بەڵام بەلەمە نوێیەکەش دەبێ شوێنێکی هەبێ بۆ ناندین، ئەمەو رێبەرەکەمان خواردنێکی عەرەبی بۆ ئامادە کردین کە پێکهاتبوو لە بیست ماسی برژاو وچەند پارچە نانێك وهەندێك لە ماست، ئێمەش وەك خەڵکی گوند لەسەر زەوی لەدەوری یەکتردا کۆبووینەوە، شوێنەکەش یەکێك لەو باخچانە بوو کە دەکەوتە سەر کەناری زێیەکە کە لەهەموو لایەکەوە سێبەری دار مێو ودارخورما بەسەر سەرمانەوە بوو، ئەمەو گۆشتی ماسی ومریشکەکە زۆر بەتام بوو، ئێمە چەقو وچەنگاڵمان بەکار نەهێنا لەکاتی خواردندا، وەك چۆن لە ئەورووپا بەکاری دەهێنین، بەڵکو بەدەست خواردنمان دەخوارد وەك چۆن عەرەبەکان خواردن دەخۆن، مریشکمان بەدەستەوە دەگرت وپارچەیەکمان لێ دەکردەوە ودەمانخوارد، بۆیەش رێبەرەکەمان زۆر دڵخۆش بوو بەم کردەوەی ئێمە، چونکە توانیمان وەك نەریتی ئەوان خواردن بخۆین.

لەوێدا سەرسوڕملن بووم بە ئافرەتی عەرەب کە دەمبینی زۆر بەکارایی نانی دەخستە نێو تەنوورەکەوە، دیارە ئەو تەنوورەش سەرەتا داری تیا دەکەن ودوایش ئاگر دەکەنەوە وهێدی هێدی ئەو دارانە گڕی دەگرت، دوای ئەوەی تەنوورەکە بەتەواوی گەرم دەبوو دەستیان دەکرد بە لێدانی هەویر تا نانی لێ دوروست بکەن، ئەو ئافرەتەی لەسەر تەنوورەکە بوو بە ئارەزووی خۆی قەبارەی هەویرەکانی بچووك وگەورە دەکرد وتا نانی بچووك وگەورەی لێ دەربچێ، ئەوەی سەرنجم دا

بۆ دورستکردنی هەر نانێك سووتەمەنێکی کەمی دەوێ، ئەمەش بەبەراورد لەگەڵ ئەو نانەی کە لەئەورووپادا دورستی دەکەن، شاری سوق شیوخ شارێکی گەورەیە ودانیشتووانێکی زۆر تیادا نیشتەجێیە وبارەگای (شێخ سوینی)ە، کە یەکێکە لەو ئەمیرە عەرەبە بەهێزانەی کە قەڵمڕەوی دەسەڵاتەکەی راست وچەپی زێی فورات دەگرێتەوە واتە لە حیللەوە تا بەسرا، هاوکات باسیش لەوە دەکرێ کە جارێکیان دژ بەحکومەت یاخی بووە ودەستی بەسەر شاری بەسرادا گرتووە، بەڵام زۆری نەبرد لەلایەن پاشای بەغداوە شکستی هێناوە ودوای شکست هێنانەکەشی بەرەو ئێران رای کردووە، بەڵام کاتێك گەڕایەوە بڕیارێکی بوردن گرتیەوە، دواتر هەموو عەرەبەکانی ئەو ناوچەیە لێی کۆبوونەوە وئەمەش ئەوەی دەرخست کە بەرهەڵستکارێکی سەرسەختی حکومەتە، لەمەوەش پاشای بەغدا بە باشی زانی بڕیاری لێبوردنی بۆ دەربکات وهاوبەشی بکات لە حکومەتەکەی، ئەو کاتە شێخ سوینی لەوێدا نەبوو، بەڵام نێردراوێك لەلایەن پاشای بەغداوە بۆ لای نێردرا تاوەکو لێنەگەڕێ وەهابیەکان زیاتر بەرەو پێش بێن وهەنگاوەکانیان بوەستێنێ، چونکە پێشڕەوییەکانیان لە کەناری رۆژئاواوە تا دوورگەی عەرەبی رۆیشتبوو، وەهابیەکان بە زەبری شیر دەیانویست ئاینەکان لەنێویاندا جێگیر بکەن، لەلایەکی دیکەوە سوپاکەی شێخ نزیکەی سی هەزار سەرباز بوو ودە هەزار لەو سەربازانەش سەربازی تورکی بوو، ئەوە جگە لە بیست هەزار سەربازی عەرەبی.

لەگەڵ رێبەرەکەمان بەنێو بازاڕدا سوڕاینەوە، ئەمەو ئەم بازاڕە تا رۆژهەڵات بەردەوامە، بەڵام تا کاتژمێر نۆی بەیانی بەردەوام دەبێ ودواتر دادەخرێ، لەپاشاندا کاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ دەکرێتەوە، رێبەرەکەمان منی بردە یەکێك لە چایخانەکان وەك نەریتی خەڵکی ئەوێ چامان خواردەوە، هەورا بەناچاری نێرگەلەم کێشا، چونکە وتیان هەر دەبی بیکێشیت، لەپاشاندا دەستیان کرد بە پێشکەش کردنی قاوە لە نێو فنجانێکی بچووکدا کە لەدورستکراوی چین بوو، ئەو فنجانانە قەبارەکەی نیوەی هێلکەیەك بوو، ئەمەو لە نێو قاوەکەدا هیچ شەکر

وشیرێکی تیا نەبوو، چونکە من ڕاهاتبووم لەگەڵ هەر شیرەمەنیەك شیر وشەکر تیا بێت دەیخۆمەوە.

### هەینی ٣٠ی حوزەیران

لەبەیانی شێخێك لەجیاتی شێخ سوینی خۆی کچەکەی هاتە لامان، کچەکەی تەمەنی دوانزدە ساڵان بوو، لەو کاتەدا هەموو دەبوایە بەپێوە بوەستن جگە لە من و لەرێبەرەکەم نەبێ، لەو کاتەدا هەلمان بۆ رەخسا سەبارەت بە رێز ونەوازشی عەرەب بزانین کە لەبەرامبەر سەرۆکەکەیان دەینوێنن، لەو کاتەدا یەکێك لە عەرەبەکان هات نامەیەکی پێبوو سەرەتا دای بە سەرکاری شێخەکە دواتر شێخ مۆرێکی لێدا، ئەمەو هەموو شێخەکان لە دەستی چەپیان ئەلقەیەکی زێر یان زیوو لە پەنجەکانیان دایە، هەندێك لەو ئەلقانەش هەندێکیان لەبەرد وکانزای بەنرخ بوو، لەلایەکی دیکەوە دوای ئەوەی لەوێ دەرچوون خەڵکێکی زۆر وەڕسیان کردین وچەندین داواکاریان بەرەو رووەمان کردەوە بەو پێیەی ئێمە ئەورووپی بووین، داوایان دەکرد هەموو سکاڵاکانیان بۆ جێبەجێ بکەین.

رێبەرەکەمان زۆر ماندوو بوو تاوەکو توانی بەلەمێکمان بۆ دابین بکا، تاوەکو پێی بچین بۆ بەغداد، کاتێکیش بەلەمێکی دابین کرد پڕ بوو لە بالە کە لە بەنگالەوە هاتبوو، هەروا لەنێو بەلەمەکەدا ئافرەتێکی ئەمریکی تیا بوو کە لەگەڵ کوڕ ودوو کچەکەی هاتبوو، کوڕەکەی تەمەنی شانزدە ساڵان بوو، کچەکەشی چواردە ساڵان بوو، کچە بچووکەشی تەمەن سێزدە ساڵان بوو، لەکاتژمێر یانزدە (سوق الشیوخ)مان بەجێ هێشت، تا کاتژمێر سێی دوا نیوەڕۆ زێیەکەمان بڕی تاوەکو گەیشتینە گوندی (غمکریك) پێدەچێ ئەو گوندە خاڵی گومرکی بێت، ئێمەش لەوێدا رەشماڵمان هەلدا، ئەمەش هەلێك بوو تا ئەو کاتەی لەوێدا بووین زۆر بەخۆشی رامان بوارد، من تفەنگەم دەست دایێ تاوەکو راو بکەم لەدەوروبەری ئەو شوێنەی کە رەشماڵمان تیادا هەلدا، لەویدا چەندین مەل وباڵندەی رەنگاورەنگم بینی، بینیم یەکێك لەعەرەبەکان یەکێك لەو باڵندانەی لەئاسمانەوە بەتەقەیەك هێنا خوارەوە وتەواو پێکای وکاتێك ویستم ئەو باڵندەیە ببینم

عەرەبەکە یەکسەر سەری لەملی جیا کردەوە، دواتر وتی (زین، زین) واتە بەکەڵکی خواردن دێ، دواتر ئەو عەرەبە چەندین مەل وباڵندەی بەردایەوە ویەکسەر سەری لەملی جیا دەکردەوە.

ئەو زێیەی ئێمە پێیدا تێپەڕین چەندین لقی لێ دەبۆوە، لەیەکێك لە لقەکانی ئەو زێیە ولەیەکێك لە خاڵەکانی گومرك سەرکاری ئەو شوێنە دانیشتووی ئەستەمبۆڵ بوو، ئەو دەستی بەسەر زۆرێك لە کەلوپەلی یەکێك لەسەرخۆشەکان گرتبوو، دیار بوو سەرکاری گومرکەکەش حەزی لەمەی خواردنەوە بوو، دواتر ئێمەش چەند بوتڵێك لە شەرابی شیرازمان پێ بەخشی، ئەویش وەك مەی (مادیرا وکلاریت) بەهەندی وەرگرت، دواتر کە ئاگامان لێ برا وئاوڕمان لێ دایەوە خۆشی سەرخۆش بوو بوو وئاگای لەخۆی نەمابوو.

### شەممە ١ی تەمموز

ئەو ڕۆژە تاوەکو کاتژمێر نۆ چاوەڕێمان کرد، تا ئەو بەلەمەی بەجێمان هێشتبوو پێمان بگات، واتە ئەو بەلەمەی کە لە سوق شیوخ بەجێمان هێشتبوو، دوای ئەوەی بەلەمەکە گەیشتە ئێمە، ئێمەش هەنگاومان نا بەرەو ڕۆیشتن، ئەو زێیە لە زۆر شوێندا زۆر لێڵە ولەهەندێك شوێنیشدا ناتوانین کەناری ئەو بەری زێیەکە ببینین چونکە زۆر پان وبەرین بوو، دواتر ڕوومان بەرەو ڕۆژهەڵات گۆڕی کە عەرەبەکان ناویان لەو زێیە ناوە شەت دجیلە، کە بەزێیەکی دیکە بەناوی (شەت حەی) دەبەسترێتەوە، ئەمەش لقێکە لە زێی دیجلە.

زۆر پێم ناخۆش بوو زێی فورات بەجێ بهێڵم، چونکە ئاوەکەی زۆر شیرین خۆش بوو، بەڵام لەسەرەتادا ئاوەکەی لێڵ بوو، بەڵام کاتێك مستێك ئاوت دەخستە نێو دەستت هەر زوو بەزوویی ساف دەبۆوە، کاتێك من ئەو ئاوەم دەخواردەوە بەهیچ شێوەیەك حەزم نەدەچووە مەی خواردنەوە، ئەمەو لە کەناڵی دجیلە هەنگاومان نا تاوەکو کاتژمێر شەشی ئێوارە، تا ئەو کاتەی گەیشتینە کەنارەکە ولەپاشاندا دووبارە ڕەشماڵمان داناوە بۆ ئەوەی پشوویەك بدەین ئەو شەو لەوێدا بمینێنەوە، هاوکات ڕەشماڵەکەشمان لەنزیك هەندێك لە ڕەشماڵەکانی عەرەب بوو، لەلایەکی

دیکەوە ڕێبەرەکەمان ئاگاداری کردینەوە کە باروودۆخی ئێرە زۆر ترسناکە، بۆیە دەبوایە چەکەکانمان لەدەستمان بێ، نەوەك هێرش بکرێتە سەرمان، لەمەوەش هەر یەکە وچەکەکانمان گرتە دەستمان و هەندێك کاتیش لەنزیك خۆمان دادەنا، بەڵام ڕێبەر وبراکانی تا بەیانی وبەدرێژایی ئەو شەوە وەك پاسەوان پاسەوانیتیان کردین، وەك لە پێشتردا باسم لەوە کردووە من ڕانەهاتووم لەسەر زەوی بخەوم وچەکەکەشم لەتەنیشتم بێ، بەڵام هەر یەکێك کە گەشت بەو جۆرە وڵاتە بکات، هیچ بەهایەك بۆ خۆی دانانێ، وەك چۆن ئەوروپییەکان بەهەمان شێوە گەشت وگەڕانەکانیان ئەنجام دەدەن، لەم جۆرە وڵاتانە بەهیچ شێوەیەك دۆخەکان سەقامگیر نین بەردەوام لە حاڵەتی شەڕدان، دانیشتووانی ئێرە هیچ سۆزێکیان نییە بۆ هیچ لایەك، بۆیە بەهەموو شێوەیەك کوشت وبڕین لای ئەوان بەهایەکی گرنگ نییە، گرنگیش تەنها ئەوە بەسەر لایەکدا سەرکەون، لەگەڵ هەموو لایەکدا لەجەنگدان تەنهاش لە هۆزەکەی خۆیان نەبێ تەبان، بۆیە گەڕیدە وگەشتەوان هەموو کاتێك لە ئاسایش ودڵنیایی دانییە، ئەمەش هۆیەکە تا هەموو چرکەیەك پێشبینی هێرشێك بێتەوە لەلایەن هێزێکی لەخۆی گەورەتر، بەڵام کاتێك خۆم ئامادە کرد بۆ ئەو سەرکێشیە وئەم گەشتە پێشبینی هەموو شتێکم دەکرد وخۆم بۆ سەختی وناخۆشی ئامادە کردبوو، بەڵام ڕێبەرەکەمان بەهەموو شێوەیەکی لەبار گەشتەکەی ڕێکخستبوو تاوەکو ڕووبەڕووی شتێکی وا نەبینەوە کە شایانی باس بێ، تا بەهەموو شێوەیەك دڵنیامان بکاتەوە ودوورمان خاتەوە لەترسناکی.

لەبەرەیانی رۆژی دووەمی تەمووز رەشماڵەکەمان پێچایەوە بەرەو ئاورێژی دجێلە هەنگاومان نا، کاتژمێر هەشت چووینە نێو زێیەکی فراوانەوە کە دەبووە دوو بەش بەشێکیان بەرەو رۆژئاوا، بەشکەی دیکە بەرەو باشووری رۆژهەڵاتەوە، دواتر لەنێوەندی ئەو زێیەدا بەرەو باکوور بووینەوە، زۆر دڵنیا نەبووم ئەو لقانەی لەو زێیە دەبۆوە بۆ ئاودێری بەکاری دەهێنن، بەڵام دواتر دەرکەوت ئاوی ئەو زێیە لەزۆر شوێنەدا بەکار دێ، ئاورێژی ئەو زێیەش بەهۆی توانەوەی بەفر وتەقینەوەی کانی چیاکانە.

لەکاتژمێر دوانزدە زێیەکمان بڕی کە ناویان لێ ناوە شەتی حەی، کە لەباکووری رۆژهەڵاتەوە دێ وبینیمان دەبێتە دەبێتە سێ بەش دوانیان بەرەو رۆژئاوا دەڕژێ، بەڵام سێیەمیان بۆ ئەو شوێنە هەنگاو دەنێ کە ئێمە بۆ رۆژهەڵات دەبرد.

ئەوەی تێبینیم کرد رێبەرەکەمان ئەو ناوچانە هەڵدەبژێری کە لەدوورەوە دەبیندرێ بۆ ئەوەی رەشماڵەکەمانی لێی دانێن، ئەمەش لەترسی ئەو گورگ ودڕندانەی کە بەشەوان هێرش دێنێ، کاتێك کە رەشماڵمان دانایەوە نزیکەی بیست کەسی عەرەب بەسواری ئەسپەوە هاتنە لامان، سوارەکان هەریەکەو شێوەیەك چەکی پێبوو لەگەڵ قامچیدا، سەرەتا رێبەرەکەمان بەخۆی وتفەنگەکەی بەرەو روویان چوو، پاش ئەوەی گەیشتە لایان سەرکردەی ئەو کۆمەڵەیە لەئەسپەکەی هاتە خوارەوە دوای چەند قسەیەك، دواتر لەگەڵ یەکێك لە کۆمەڵەیەکی دی کە ئەوانیش بەرەو روومان دەهاتن لەمەبەستەکانی یەکتر گەیشتن لەپاشاندا هەردوو کۆمەڵە بوون بەیەك کۆمەڵە، ئەوەی تێبینم کرد لە دوو کۆمەڵەیە کە سەرکردەکان سواری ئەسپی زۆر بەنرخ بوو بوون، کە نرخەکەی لە ئەسپەکانی دیکە زۆر ترە، ئەوەی لای بێگانەیەك کە جێگەی سەرسوڕمانە تەنها بەجلوبەگ ناتوانی پیاوە گەورەکانی ئەو وڵاتە جیا بکەیتەوە، بەڵام دەتوانی بە ئەسپی بەنرخ ئەوە جیا بکەیتەوە، کە ئەوەی بەرەو رووت دێ یەکێك لەپیاوە دەوڵەمەند وگەورەکانی ئەو ناوچەیەیە، ئەوەی کە سەیرە دەبینی شێخ جلوبەرگی خزمەتکارەکەی زۆر لەهی

خۆی پۆشتەترە، هەروا خۆی وخزمەتکارەکەی لەیەك دەفردا نان دەخۆن، هەروا هەردووکیان یەکسانن لەماف وشکۆداری.

راوکردن یەکێك لەو خۆشیانەیە کە من هۆگری بووم، هەموو هەلەکانم بۆ راوکردن دەرەخساند، هەموو کاتێك لەکاتی راوکردندا کەسێك یان دوو کەس لەعەرەبەکانم لەگەڵ خۆما دەبرد، بەڵام لەوێدا کەسم پێ رازی نەکرا تا لەگەڵما بێ، هەروا رێبەرەکەمان حەزی نەدەکرد نەخۆم بچم بۆ راو نەکەسیش لەگەڵما بێ، ئەمەش بەهۆی دارستانێکی چڕ کە گوایە پڕە لەشێر، رێبەرەکەمان پێشبینی ئەوەی دەکرد کە لەکاتی شەودا ئەو شێرانە هێرش بکەنە سەرمان، بۆیە شەو تا بەیانی خۆیی وبراکەی بەخۆیان وتفەنگەکانیان پاسەوانیان کردین ودەسوڕانەوە، هەروا سوار ئەسپەکانی هەردوو کۆمەڵە کە لەولاتر بۆ پاراستنی ئێمە لەوێ بوون دیمەنێکی زۆر جوان بوو، بەڵام ئەوەی سەیرە لەنێوەندی زۆربەی سەرچاوەکان ئەوە دەردەکەوێ کە عێراق شێری تیا نییە وتیایی ناژی.

لە رۆژی سێیەمدا، کە بەرواری رۆژی چوارەم بوو لەمانگی تەموزدا دووبارە رەشماڵەکەمان پێچایەوە ولەکاتژمێر شەشدا گەیشتینە ئەو شوێنەی کە هەردوو زێ بەیەکتر دەگەن، کە یەکێکیان لە لەباکوری رۆژئاواوە دێ وئەویتر لە باکوورەوە دێ، ئێمە لقی دووەممان هەڵبژارد بۆیە تا کاتژمێر سێی دوای نیوەڕۆ ئێمە سەولمان لێدا، لەو زێیەدا تەوژمی ئاو زۆر خێرا بوو، ئەمەش هۆکارێك بوو تا عەرەبەکان زۆر بەئاسانی هەموو کێڵگەکانیان ئاو بدەن، ئەمەو خاکێکی زۆر فراوانیان هەیە کە خەڵکی تیا ناژی، ئەگەریش نەتوانن کێلگەکانیان ئاو بدەن ئەوا زۆربەی درخت ومیوەکانیان رۆژ دەیسووتێنێ بەتایبەتی لەو وەرزەدا.

لەکاتژمێر پێنجی ئێوارە بەلای گوندێکی کەناری رۆژئاوادا تێپەڕین کە ناویان لێ نابوو (واست) لەوێدا پانی زێیەکە یەك میل بوو، ئەمەو رێبەرەکەمان داوای کرد بەهیچ شێوەیەك نزیکی ئەو گوندە نەبینەوە وبۆیە سەولەکانمان بەرەو کەناری بەرامبەر سووڕاندەوە، رێبەرەکەمان کاتی شەو داهانت پێی گوتین ئەم گوندە چەندین دز وجەردەی تیایە بەهیچ شێوەیەك بەزییان نییە، چونکە ئەم گوندە لەژێر

رکێفی حکومەت وهیچ کەسێکدا نییە، تەنهاش لەژێر دەسەڵاتی شێخەکەیانن کە بەهیچ شێوەیەك دژی ناوەستنەوە وهەموو فەرمانێکی جێبەجێ دەکەن.

لەکاتژمێر شەشی ئێوارە بەخێرایی سەوڵمان لێدەدا تاوەکو شوێنێك بدۆزینەوە تا رەشماڵەکەمانی تیادا دامەزرێنین، لەگەڵ ئەوەی شوێنێکی شیاومان نەدۆزیەوە تاوەکو رەشماڵی تیا هەڵدەین، بەڵام لەکۆتایدا لەسەر کەناری زێیەکە رەشماڵەکەمان هەڵدا، رێبەرەکەمان لەترسی هێرش کردنە سەرمان زۆر بەئاگا بوو، هەروا نەیهێشت بەهیچ شێوەیەك راو بکەم، چونکە لەتەنیشتمان دارستانێکی زۆر چڕ هەبوو، لەکاتژمیر یەکی بەیانی رۆژی پێنجەمی تەموز گوتی دەبێ رەشماڵەکەمان بپێچینەوە، هەروا رێبەرەکەمان جەختی لەوە دەکردەوە کەنابێ لەو ناوچەیە بمێنینەوە، چونکە ئەم شوێنە هیچ دڵنیایی وئاسایشێکی تیادا بەدی ناکرێ، لەکاتژمێر شەشیش وەستاین ئەمەش پاش ئەوەی زێیەکە لەچەندین شوێندا پێچاوپیچی هەبوو، دووبارە لەکاتتژمێر شەشدا وەستاینەوە تاوەکو پشوویەك بدەین نیوکاتژمێر پشوومان دا، دواتر بە سەوڵی بەلەمەکەمان دەستمان سەوڵ لێدان کردەوە، لەرێگەمان گەیشتینە شاری حەی ئەویش بەناوی زێیەکەوە نراوە، حەی دەکەوێتە سەر کەناری رۆژئاوای زێیەکە ودانیشتووانەکەشی لە خەڵکی واست باشتر نییە سەبارەت بەهەڵوێستیان بەرامبەر حکومەت، هاوکات لەدەرەوەی رێبەرکەمان توانی سی کەس بەباشترین چەك وتفاق رێکخارابوون تا دژی حکومەت هەنگاو بهاوێن، دیارە بۆچوونی رێبەرەکەشمان لەوەوە هات تاوەکو هیچ باجێك نەدا کە خەڵکی ئەو شارە داوامان لێبکەن

رێبەرەکەمان رایەخێ لەسەر زەوی دانا وپاشان خۆی وبراکەی لەسەری دانیشت ولەتەنیشتیشیان ئەفسەرە وگەورەکان وسەربازە لێهاتووەکان لەتەنیشتیەوە دانیشتن کە هەموویان چەکدار بوون، دواتر هەموو پیاوە گەورەکانی ئەو شارە بۆ سەردانی هاتن، ئەوانیش بەهەڵەداوان خزمەتیان دەکردن وقاوەیان دەدانێ، بەڵام لەهەمووی سەیرتر رێبەرەکەمان هیچ کاتێك بەبێ تفەنگەکەی بەهیچ لایەکدا رێی نەدەکرد لەهەر کاتێکیش بیویستبایە تەقەی دەکرد، هاوکات هەموو پیاوەکانی دیکەش وەك ئەو لە ئامادە باشیدا بوون، دیارە ئەمجۆرە ئاهەنگە لەلای یەکێکی بێگانە

شتێکی نامۆ بێ، ئەمە جۆرێك لەدابو نەریتیان بوو، بەئاگابوونیش شتێکی پێویست بوو، کاتێکیش هەموو پێکەوە نان دەخوارد دڵنیا دەبوون کە هیچ شتێکی خراپ لە ئارادا نییە، لەلایەکی دیکەوە عەرەبەکان لەگەڵ بێگانە ئاو ونان دەخۆن بەبێ ئەوەی سڵی لێ بکەنەوە، هاوکات ئەگەر ئایینیشی لەگەڵیدا جیا بێ، ئەوە جگە لەوەی خۆی بەرەو هەڵدێر دەبات کاتێك دەبینێ بێگانەکە ژیانی لەمەترسیدایە، هەر کەسێکیش ژیانی لەمەترسیدا بوایە ئەوە دەچووە پەنای ئەو عەرەبانە، زۆر پشتی پێ دەبەسترا، ئەم شێوە دابونەریتە لە کەناری رۆژئاواش بەهەمان شێوەیە، وەك باس لەوە دەکرێ کە موژدەبەرێکی فەرنسی کاتێك لە بیابانەدا بەرەو بەسرا دەچێ، تا لەوێوە بەرەو هیند بڕوا لەرێگەدا رووبەڕووی چەندین هێرش بەر دەبنەوە، موژدەبەرەکە بۆ ئەوەی بەرگری لەخۆی بکات بەتفەنگەکەی یەکێك دەپێکی وبریندار دەبێ، دواتر موژدەبەرەکە خۆی دەمرێنێ کاتێك دەگەنە سەری هەموو جلەکانی لەبەر دەکەنەوە ودەیدڕێنن، دواتر دەزانن نەمردوە هەموو دڵخۆش دەبن وتا ئێوارە قسەی خۆش وبەسەرهاتی سەیر سەیر بۆ یەکتر دەگێڕنەوە وقاوەی پێشکەش دەکەن، دیارە برینەکانی موژدەبەرە فەرنسیەکەش زۆر ترسناك نەبووە، بەڵام کاتێك هەڵسایەوە بینی رووت وقووتە، بەڵام ئەویش شارەزایی هەموو ئاکارەکانی عەرەب بوو بوو، کاتێك وەئاگا هاتەوە ویستی بزانێ کامەیان لەنێو ئەو چەکدارانە سەرۆکیانە، بینی یەکێك بەتەمەن لەهەموویان گەورەترە، بۆیە یەکسەر هەروا بەرووتی بەرەو رووی چوو وپێیەکانی ماچ کرد، ئەمەو سەرکردەی ئەو کۆمەڵە چەکدارە بەعەبایەکەی خۆی لەشی ئەو موژدەبەرەی داپۆشی، دواتر چەند جلوبەرگێکیان دایێ ولەبەری کرد، سەرۆکی کۆمەڵە چەکدارەکە بەڵێنی پێدا تا بەسرا بە ساغ وسەلامەتی بیگەنێ، پاش ئەوەی فەرەنسیە موژدەبەرەکە بەڵێنی پێدا سەد قروشی ڤینسی پێبەخشێ، هەردوو لا لەسەر ئەوە رێککەوتن کە سەرۆکی کۆمەڵە چەکدارەکە بەساغ وسەلامەتی بیگەیەنێتە بەسرا، دواتر موژدەبەرەکە یەکێك لە بەلەمە چارۆگەدارەکان گرت تاوەکو هەموو کەلوپەلەکانی بیگەیەنەتە مەسقەت، دواتر نیشتەجێ بەریتانیەکە بەمەی زانی ناردی بەدوای موژدەبەرەکە ودواتر لەلای خۆی

بە پزیشکێکی بەریتانی هەموو برینەکانی سارێژ کرد، ئەوەی شیاوی باسە ئەگەر برینەکانی ئەو موژدەبەرە سارێژ نەکرابوایە ئەوا تا دەگەیشتە هیند ئەوا دەمرد.

لەلایەکی دیکەوە وەك شتێکی ئاسایی دانیشتووانی ئەو ناوچەیە هێرش دەکەنە سەر هەموو بەلەم وکەشتیەك کە بەناوچەکەیان تێپەڕ دەبێ وتا باج وسەرانەیان لێ وەرگرن ویاخود دەستیان بەسەر هەموو ئەو بەلەم وکەشتیانە دادەگرت تا لەژیانی رۆژانەیان سوودی لێ وەربگرن.

لەگەڵ ئەوەی شاری حەی شارێکی بچووکە ولەدەوریدا دیوارێکی قوڕین هەیە، بەڵام رێژەی دانیشتووانی گەلێك زۆرە، بەراورد بە رووبەرەکەی، ئێمە کاتژمێر پێنج ئەوێمان بەجێ هێشت وزۆر بەخێرایی سەوڵمان لێدەدا تاوەکو زۆر بەزوویی لەو شارە ولە خراپەکارەکانی دوور بکەوینەوە، کە لەلای هەندێکیان گومانمان لێ دەکرا کە ئێمە پارەیەکی زۆرمان پێیە ودواتر لەکاتی شەودا هێرش بەرنە سەرمان، بۆیەش زۆر بەخێرایی سەوڵمان لێدەدا تاوەکو دوورکەوینەوە لەشەڕ وگێچەڵیان.

لەو کاتەی ئێمە لەنێو بەلەمەکەمان دابووین کولۆیەکی زۆر بەلاماندا تێپەڕ دەبوو، ئەوەی تێبینم کرد ژمارەی ئەو کلۆیانە گەلێك زۆرە وقەبارەیان گەورەیە وقەبارەکەشیان ئاسایی نییە وهەندێکیشیان رەنگاورەنگن وزۆربەشیان رەنگیان سەوزە، ئەمەش وای لیکردم وێنەیان بکێشم.

دووبارە لەکاتژمێر چواری بەیانی رۆژی پێنج لەسەر شەشەم لەمانگی تەموز رەشماڵەکەمان پێچایەوە دیسانەوە بەلەمەکەمان هەنگاوی نا تا کاتژمێر دەی شەو هاوکات لەو کاتەوە تا کاتژمێر شەش دووبارە سەوڵمان لێداوە لەسەر کەناری رۆژهەڵات وەستاین ورەشماڵەکەمان دانایەوە.

یەکێك لەعەرەبەکان لەگەڵمدا هات بۆ ئەوەی بچین بۆ راو، چونکە ئەو شوێنە ولەدووری میلێك لەزێیەکەوە چەندین باڵندەی جۆراو جۆر هەیە، کە هەر جۆرێکیان بەهەزاران دەبیندرێ، ئەوە جگە لەوەی لەنزیك ئەو شوێنە چەندین حەز وگۆماو هەیە، لەهەندێك شوێنیشدا ئەو حەوز وئاوانە وەك کۆگا بەکار دێ بۆ کاتی پێویست وکاری پێویست، هەر لەو شوێنەشدا شەپۆڵەکانی زێیەکە بۆ بەخێرایی خۆی لەکەنارەکە دەدا، بۆیە لەهەندێك شوێندا دەبینی رەنگی خاکەکە

جیایه وەك لەهەندێ شوێندا خاکەکە خوێاویە یاخود خاکەکە لماویە، سەبارەت بە ئەو شوێنانەی کە خوێاویە لەهەندێك شوێندا خوێ بەبەرزی نیو پێ بەرز بۆتەوە، ئەوە جگە لەوەی خاکی ژێر خوێیەکەش خاکێکی تەماوی گەنم رەنگییە وەك کەناری زێیەکە، لەلایەکی دیکەوە ئەگەر سەیری رووبەرێکی دوور بکەی دەبینی زنجیرەیەك چیایی گەورە وبلند هەن کە بەرەو باکووری رۆژهەلات بۆ باشووری رۆژهەلات دەکشێن وپێی دەلێن چیایەکانی کوردستان.

ئێمە لەکاتژمێر چواری بەیانی رۆژی هەینی وحەفتی تەموز دەستمان بەگەشتەکە کر دەوە ولەکاتژمێر هەشت گەیشتینە بەشێکی نێو زێی دیجلە کە پێی دەلێن شەت عمارە، کە دەکەوێتە لایەکی دی ئەو کەنارە، هەروا لەرۆژهەلاتی زێی دیجلە شارێکی بچووك هەیە پێی دەلێن کوت، لەوێش واتە لەکەنار زێیەکەدا چەندین کەشتی گەورە کەلوپەلەکانیان دەهێنا خوارەوە، لەمەوەش بۆمان دەر کەوت کە شەتی حەی تەنها چەند جۆگە وکەنالێك بووە تا کاری ئاودێری بۆ کێڵگەکانی کشتوکالی پێ بکرێ، بەلام ئەو کەنالْ وجۆگانە بەپێی رۆژگاری فراوان تر بۆتەوە وئاوەکەشی سازگارە وەك چۆن ئاوی تایمزی ئینگلتەرا وایە، پانی زێی دیجلە لەم شوێنە نزیکەی میلێکە، کاتێکیش کەوەرزی توانەوە دێ بەرزی ئاوەکە دەگاتە دە پێ، هاوکات زێیەکە لەزۆر شوێندا گێژەن بەخۆیەوە دەگرێ، لەکاتژمێر شەشدا بەتەنیشت سەربازگەیەکی تورکیدا تێپەڕین، دیارە رەشمالْ وچادرەکانی تورکی رەنگاورەنگ جوانن وهەندێکیان سەوز وسپی وسوورن، ئەو سەربازگەیە شەش هەزار جەنگاوەری لەخۆ گرتووە وهەروا پاشاش دوو کەشتی هەیە کە سوپا پاسەوانی دەکات، باری هەر یەك لەو کەشتیانەش سەد وپەنجا تەن بار بوو، دیارە ئەو کەشتیانەش لەجۆری (ئەندیز رۆژهەلات) دورستکراوە.

دیارە ئەو سوپایەش بۆ رەتدانەوەی هەموو یاخی بووە عەرەبەکان هێندراوەتە ئەم شوێنە، چونکە هەندێك لەیاخی بووەکان شێخی حلە وچەندین فەرمانبەری حکومەتیان کوشتبوو، لەمەوەش رێبەرەکەمان باشترین وجوانترین جلوبەرگی خۆی لەبەر کرد تاوەکو سەردانی پاشای ئەو سوپایە ئەوێ بکات.

لەکاتژمێر سێی بەیانی رۆژی شەممەی هەشتی تەموز بە بەلەکەمان سەوڵمان لێدا تا کاتژمێر دوانزدەی نیوەڕۆ دواتر لەبن سیبەری گەڵای دارەکاندا پشوویەکمان دا، لەوێدا بۆنێکی زۆر ناخۆش ئەو ناوەی داگرتبوو، لەوێدا پێیان گوتین ئەو بۆنە بۆنی لەشی ئەو کوژراوە عەرەبانەیە کەلەلایەن سوپای تورکیەوە کوژراون، هەروا گوتیان هەندێك لەسەرکردە عەرەبەکان دوای ئەوەی رایان کردووە زۆرێك لەمێگەلیان لەدوای خۆیان بەجێ هێشتووە، دوای ئەوەی سەربازەکان دەستیان بەسردا گرتووە هەموو مەڕومالاَتەکانیان ناردۆتە بەغدا.

گەشتەکەمان لەکاتژمێر چواری بەیانی دەست پێ کردەوە تا کاتژمێر شەش ونیوی ئێوارە سەوڵمان لێدا دواتر بۆ پشوودان، دواتر کە دەستم دایە تفەنگەکەم بەرەو راوکردن رۆیشتم بۆ ئەوەی ئەو باڵندانە راو بکەم کە لەباڵندی ئینگلیزی دەچن، لەوێدا بۆم دەرکەوت زەوی لەوێدا بەهیچ شێوەیەك نەکێڵدراوە وهیچ بەربوومێکی لێ نییە، چونکە خاکەکەی هەمووی خوێاویە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر کەناری زێیەکە دارودرەختێکی چڕ هەموو لایەکی داگرتبوو، لەنێو ئەو دار ودرەختە چڕە عەرەبەکان لەنێوەندیدا شوێنێکیان دیاری کردووە تا مەڕومالاَتەکەیان بەوێدا تێپەڕێنن وتا هەموو مەڕو مالاَتەکەیان بگەیەننە سەر ئاو، لەنێوەندێکی دووری زێیەکەوە دوورگەیەکی بچووکمان بینی ولەنزیکیەوە بەشێك لەکەشتیەکی گەورە لەوێدا پەکی کەوتبوو، ئەو کەشتیەش پێش سێ هەفتە لەو دوورگەیە پەکی کەوتبوو کە بەهاکەی دە هەزار رووپیە بوو، کەلوپەلەکانی نێویشی چوار هەزار دۆلاری ئیسپانی بوو، کە دەیویست ئاسن ببات بۆ بەسرا، هاوکات پاسەوانەکانی ئەو کەشتیە پاسەوانی کەشتیەکەیان دەکرد تا ئەو کاتەی ئاوەکە دادەبەزێ، ئەمەش زۆر بەکەمی دەبێ، زۆرجارانیش لەپێش ئاهەنگی لەدایکبوون دەبێ.

لەگەڵ ئەوەی پانی زێیەکە لەو شوێنەدا دوو میل بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەردوو پاسەوان کە پاسەوانی ئەو کەشتییەیان پێ سپێردر ا بوو، بەمەلە زێیەکەیان دەبڕی، زۆرجارانیش کاتێك زێیەکەیان دەبڕی جلوبەرگ وچەکەکانیان لەسەر سەریان دادەنا، کە بەهیچ شێوەیەك پشکێك ئاویشی پێ نەدەکەوت،

ئەو پیاوانە پێیان راگەیاندین کە کاتی لەسەر کەنارەکە دەبن هەست بە ئاسوودەیەکی زۆر دەکەن، چونکە ئاو وهەواکەی زۆر سازگارە، چونکە لەتەنیشتیا دارستانێکی بچووکی لێیە، ئێمەش بەگوێی ئەوانمان کرد ولەکاتژمێر نۆ زێیەکەمان بڕی و چوینە کەنارەکە، پێش ئەوەی لەوێ بڕۆین بەیانی رۆژی دووشەممەی دەیەمی تەموز هەندێك لەعەرەبە نیشتەجێبووەکانی ئەوێ هاتنە لامان، کە لەلای چەپ وراستی کەنارەکە نیشتەجێ بوو بوون، ئەوە جگە لەچەندین مێگەلی مەڕومالات لەدەوری رەشماڵەکانیان هەبوو، ئێمە زۆر هەستمان بەدڵنیایی دەکرد کاتێك لەنێوەندی ئەو عەرەبانە دابووین، رێبەرەکەمان پێی راگەیاندین کە ئێمە هەموو ناوچە ترسناکەکانمان بڕیوە، پاش ئەوەی لە نزیکترین خاڵی حکومەت دابووین، دەستمان بەهەنگاوناوە کرد لەتەنیشت کەناری زێیەکەدا، لەوێدا چەندین مێگەلی حوشترمان بینی، کاتێك ریگەمان دەبڕی هەلمان بۆ رەخسا تاوەکو چاودێری بای گەرم بکەین کە خەڵکی ناوچەکە ناویان لێناوە (سمێل) کە هەندێك جار گەرمیەکەی زۆر ناخۆشە ووەڕست دەکات، ئەوەی راستی بێت (سمێل) دەکەوێتە ناوچەی دهۆك وخەڵکی کوتیش هەر ئەو ناوەیان لێناوە، بەڵام لەناوچەی هەولێر وکۆیە ناویان لەمە ناوە رەشەبا، ئەم بایە زۆر ترسناکە بەتایبەتی لەنێوان کاتژمێر دوانزدە وسێی دوا نیوەڕۆ، ئەم بایەش هێزی گەرمی زیاتر دەبێ، کاتێك بەسەر بیابانێکی گەرم وبێ دارودەخت هەڵدەکا، بەڵام ئەگەر بەسەر دارستان وکشتوکاڵدا هەڵ بکا، ئەوا گەرمیەکەی کەمترە، بۆ نموونە کاتێك مستەر ستیفنز چووە ناو ئاوەکەوە کاتێك هاتە دەرەوە شەرواڵێکی تورکی لەبەردابوو وبەتەڕی هاتە دەروە بەڵام بەچەند خولەکێك یەکسەر بەهۆی گەرمیەوە شەرواڵەکەی وشك بۆوە، ئەگەر خۆم نەمبینبایە ئەوا بڕوام نەدەکرد، کاتێکیش من وکابتن رید دەچووینە راو وهەستم بەوە دەرکرد کە ئەویش وەك من زۆر ئارەزووی لەراو کردنە، بەڵام ئەمجارەیان بەهۆی توندی گەرماوە نەیتوانی لەگەڵمدا بێ بۆ راو کردن، ئەو گەرمایە ئەوەندە ناخۆش بوو، بۆیە لەکاتی ئێواران زۆر بەخێرایی سەوڵمان لێ دەدا، تاوەکو بگەینە کەناری رۆژهەڵات ولەوێش لەبن سێبەری

دارودرەختدا پشوویەك بدەین، كاتێك لەنێو بەلەمەكەدا بووین كەمتر هەستم بەتوندی ئەو گەرمیە دەكرد.

لەكاتژمێر چواری بەیانی رۆژی سێشەممەی یازدەی تەموز دەستمان بەگەشتەكەمان كردەوە بەدرێژایی كەناری رۆژهەڵاتی زێیەكەدا دەڕۆیشتین ولەویدا چەندین باڵندە ومەلمان بینی، دواتر كە ئێوارە داهات دووبارە لەلای رۆژهەڵاتەوە چووینەوە سەر كەنارەكە ولەنزیكدا رەشماڵمان هەڵدا بۆ ئەوەی پشوویەك بدەین وئەو شەوە لەوێدا بین، رەشماڵەكەشمان نزیك بە رەشماڵی عەرەبەكان بوو، بەڵام رێبەرەكەمان پێشبینی ئەوەی نەدەكرد لەلایەن ئەو عەرەبانەوە هێرش بكرێتە سەرمان، لەلایەكی دیكەوە تەندورستی كابتن رید هێدی هێدی بەرەو خراپی دەڕۆیشت، ئەمەش بەهۆی نەبوونی هیچ هاوكاریەكی پزیشكی وبزركانی رەنگ وروویی، كاتێك من لەهیندستانەوە بەرەو گەشتەكە بەڕێ كەوتم لەنیو قووتوویەك چەندین دەرمانم لەگەڵ خۆمدا هێنابووم، كە پزیشكەكەمان لەهیندستان بۆی ئامادە كردووبووم، بەڵام كاتێك دەرمانەكەم پشكنی بینم دەرمانەكە هەمووی تێكچوو بوو، ئەمەش دوای ئەوەی لە دوورگەی كەرك ئاوی پێ كەوتبوو.

لەوێدا تێبینی ئەوەم كرد كە چەندین جۆری باڵند ومەل هەیە، تەقەم لە زۆرێك لەو باڵندانە كرد، بەڵام هیچ كام لەو باڵندانەم راو نەكرد، دووبارە لەكاتژمێر چواری بەیانی رۆژی دواتر دەستمان بەگەشتەكەمان كردەوە، دیسانەوە دوای كاتژمێرێك پشوویەكمان دا، زێیەكە لەو كاتەدا بوو بووە گێژەن، لەو نزیكانە چەندین كەرافاتی سووپای توركیمان بینی، هەندێك لەو بەلەم وكرافاتانە پڕ بوو لە شووتی، بەردەوام سەوڵمان لێدەدا تا كاتژمێر شەشی ئێوارە، گەشتەكەمان لەكاتێكدا پچڕا كاتێك لەنێو زێیەكەدا چەند كەسێك بەقامچی دەیانویست یەكتری بكوژن، زۆریشی نەمابوو سەوڵ لێدەرەكانی ئێمە رووبەڕووی شەڕێك ببنەوە، ئەوێمان بەجێ هێشت چووینە شوێنێكی دیكە تاوەكو پشوویەك بدەین، چونكە بینیمان ئاو لەوێدا دە پێ بەرز بۆتەوە، كاتێك دەستمان بەگەشتەكەمان كردەوە لەرێگە چەندین كەشتی گەورەمان بینی كەباری هەندێك لەو كەشتیانە دە تەن زیاتر بوو، هەموو كەشتیەكانیش لەدار دورست كرابووون، دیارە دورستكردنی ئەو

جۆره کەشتیەش بەپێی ئەو کارانە بوو کە پێویستیان پێی هەبوو، بەشێوەیەك ئاگاداری ئەوە بوون کە تاچ رادەیەك دەتوانی بار هەڵبگرێ، لەلایەکی دیکەوە هەموو ئەو کەسانەی کە باوانیان دارتاش بوونە هەموویان بوونەتە دارتاش وئەوانەی لەدەریای وزێیەکاندا لەگەڵ وبەلەم وکەشتیەکاندان وەك بابوباپیرانیان هەر ئەو کارە دەکەن، ئەمەش وادەکا لەنێوەندی بنەماڵەکاندا هیچ دەمارگیریەك نەیەتە کایەوە، بۆیە هەموو ئەو خەڵکانە بۆ ماوەیەکی دورودرێژ بەهەمان زمان وجلوبورگی بابوباپیرانیان هەڵسوکەوت دەکەن وبەهەمان شێوەیەش نان دەخۆن وئاو دەخۆنەوە.

هەتا شێوازی شەڕ وجەنگەکانیشیان هەمان شێوازی کۆنە وتەنهاش چەند شتێکی ورد گۆڕاوە، چونکە هەموو گەل ونەتەوەکان بە سەردەمێکی شۆڕشگێڕانە تێپەڕیوون، لەهەمووی سەیرتر ئەگەر یەکێك لێرە بیەوێ چەند گۆڕانکاریەك بخاتە نێو کاری بازرگانی ئەوا بەرامبەرەکان لەلای موفتی سکاڵای دژی دەخەنە روو، ئەو کەسەی دەیەوێ ئەو گۆڕنکاریە بهێنێتە کایەوە دەبێ نرخ وبەهایەکی زۆر بدات تا ئەو گۆڕانکاریە بهێنێتە کایەوە.

لەلای رۆژئاوادا بەتەنیشت شارێکی بچووکدا تێپەڕین کە نزیك زێیەکە بوو، ئەو شارۆچکەیەش ناوی (جفر)، ئەو شارۆچکەیەش مزگەوتێکی زۆر جوانی تیا بوو، کە لەدەورەوە خۆی بەدەردەخست، لەکاتژمێر نۆ ئاورێژی ئەو زێیە گەورەیەمان بڕی کە لە باکووری شەتی دیالەوە بۆی دێ، لەکاتژمێر نۆ ونیو بە بەلەمەکەمان زۆر خێرایی بەرەو کەناری رۆژهەڵات هەنگاومان نا، لەوێدا ئاو زیاتر لە دوانزدە پێ بەرز دەبێتەوە، ئەو کەنارەش لەهەموو روویەکەوە تەلەزگە وپێچاوپێچی هەبوو ولەوێدا دارودرختەکان زۆر چڕبوون، بۆیە ناچار بووین هەموو ئەو دڕك ودالانە لاببەن، تاوەکو لەوێدا پشوویەك بدەین، هاوکات لەنێوەندی چەند جۆرێك لە رووەکی گوڵەکانم بینی، کە بۆن وبەرامی زۆر خۆش بوو.

لەکاتژمێر دووی بەیانی رۆژی هەینی چواردەی تەموزی ١٧٩٧، تا کاتژمێر دووی پاش نێوەڕۆ دەستمان بەگەشتەکەمان کرد وگەیشتینە بەغدا، لەوێدا زێیەکە لەهەموو لایەکەوە گێژەن بوو، بەڵام ئەو شوێنەی کە ئێمە لێوەی هاتین ئەگەر بەپێ بهاتباین، ئەوا تەنها سێ کاتژمێرمان پێ دەچوو، گەیشتینەماڵی بەڕێز ج.ل.رینۆ (یاریدەری مستەر مانستیی کونسلگەری بەریتانی لەبەسرا) ئەو ماڵە شێوازەکەی بازنەیی بوو ولەشوێنێکی زۆر گونجاو بوو لەسەر زێیەکە، ئینگلیز لەشاری بەغدا بەهایەکی زۆری هەیە، ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ ڕەوەندی ولاتانی دیکە، چونکە ئینگلیزەکان لەجیاتی ئەوەی کەلوپەلەکانیان ببرێتە کومرك، یەکسەر کەلوپەلەکانی دەگوازنەوە بۆ ئەو شوێنەی کە دەیەوێ تیایدا بمینێتەوە، لەوێش ئەفسەرێك دەنیردرێ تا کەلوپەلەکانی بپشکنن.

ئەم بەهایەش لەلایەن مستر مانستیەوە داواکرا بوو، تا سوودی هەبێ بۆ گەشتیارە ئینگلیزەکان، بەغدا دەکەوێتە سەر کەناری رۆهەڵاتی زێی دیجلە، کە لەدەوریدا دیوارێك بەدرێژایی سێ میل دەوری داوە، بەڵام بەشێوەیەکی چوارگۆشەیی، لەگەڵ ئەوەی خانووەکانیان جیایە لەگەڵ خانووی ئەورووپیەکان، بەڵام زۆر باشترە لەخانووەکانی بەسرا، لەشاری بەغدا باڵەخانە گشتیەکان بەشێوەیەکی زۆر جوان نەخشێندراوە وەك مزگەوت وگەرماوەکانی ئەو شارە، ئەوە جگە لەوەی لەنێو شاری بەغدا بازارێکی فراوانی تیایدا، بەڵام نرخەکانی زۆر بەرزترە لەو نرخانەی کە لە بەسرادا هەن، ئەرمەنیەکان لەوێدا پێکهاتەیەکی سەرەکی بازرگانی وخاوەن کارگەکانن، بەڵام ئەو کارگانە بەرهەمەکانیان دیاری کراوە وەك خواردن وجلوبەگ و کەلوپەلی سەراج وکەلوپەلی ناندین، ئەرمەنیەکان لەمووسڵەوە ولەرێگەی زێی دیجلە زۆرێك لە ئاسن دەگوازنەوە، ئەوە جگە لەوەی دارێکی زۆر دەگوازنەوە، دواتریش ئەو ئاسنانە دەگوازرێتەوە بەسرا، لەوێدا ئەو ئاسنانە دەتاوێننەوە ودەیکەن بە ئاسنی چوار گۆشەیی وەك چۆن لە ئینگلترا دورست دەکرێ، ئەم بازرگانیە بەم دواییە گەشەی سەندووە وهەموو دەخرێتە نێو

ئەو کەشتیانە تا بۆ ولاّتان بنێردێ، ئەم کارەش جۆرێك وەڕسکردنی بازرگانە ئینگلیزەکانە، چونکە کارکردن و بازرگانی کردن لەم ولاّتانە پارەیەکی کەمی دەوێ، کەچی لە ئەورووپا پارەیەکی زۆری دەوێ وکارێکی قورسە، بەپارەیەکەی کەمیش وا لە بازرگان وکارگەکان دەکا بەنرخێکی کەم کەلوپەلەکانیان بفرۆشن.

بەغدا شارێکە جیا لەشارەکانی دیکە زۆر بە پتەوی بنیات نراوە، بەلاّم زۆر جیایە لە شارەکانی ئەورووپا، وەك باسمان کرد خانووەکانی بەسرا وەك بەندینخانە دورستکراوە، لەلایەکی دیکەوە جادە وکۆلاّنەکانی بەغدا خۆلّ وخاشاك وتەسکن، لەم وەرزەشدا زۆربەی خەلّك لەسەر بانەکان دەخەون، چونکە پلەی گەرمی وا دەکا نەتوانی لە ژوورەوە بخەوی، بەلاّم لەهەمووی ناخۆشتر تورکەکان لەوێدا لەکاتی شەودا هەر کەسێك بێتە دەرەوە وبێتە کۆلاّن ئەوا تەقەی لێ دەکەن، ئەو خانووەی من تیایدا دەنووستم لەنزیکی ناوەڕاستی شاردا بوو و خانووەکەش لەهەموو خانووەکانی دیکە بەرزتر بوو، بەلاّم بەرزتر نەبوو لە مزگەوتەکان وبالّەخانە حکومیەکان وهەندێك خانووی وەزیر وئەفسەرە گەورەکان، ئەوەی سەیرە لەشاری بەغدا لە شوێنە بەرزەکاندا لەقلەقێکی قەبارەی گەورەم بینی، هەروا لەشاری بەغدا خەلّکە هەژارەکەی لەبێ ئاوی بەپشت ئاو لە کەنالّەکان دەهێنن وهەندێکی بەکەر وبار ئاو دەهێنن، کاتێکیش لەدیواری بەغدا دەچیتە دەر تەنها بیابیانێکی وشك وبرینگ دەبینی وهیچ جۆرە رووەکێکی تیادا نابیندرێ ئەوە جگە لەوەی هیچ ئاو وکشتوکالّێك نابیندرێ.

بەلاّم لە رۆژهەلاّتی ئەو شارەدا بێستانێکی گەورە دەبینی کە لەشارەوە چوار میل دوورە وخەلّکێکی زۆر لەوێدا دەژین وئەو شوێنە بەبێ دیواریشە، هەروا شارەکە لەرێگەی ئەو بێستان وکێلّگەی کشتوکالّیانە هەموو بەربوومێك دەنێردرێتە شار، لەلایەکی دیکەوە هەندێك لە کەسایەتیە دیارەکانی ئەو شارە خانووی گەورە گەورەیان دورست کردووە بەتایبەتی لە شوێنی شاری (سلیوسیا) کە سیلۆکس دورستی کردووە وئەویش یەکێك بووە لە ژەنەرالاّکانی سەردەمی ئەسکەندەری مەقدۆنی کە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا بوو لە بەڕێوەبردنی ئەو ناوچەیە، ئێستاش دراوەکەی یەکێك لەو دراوانەیە وەك پەند

وئامۆژگاری دەخرێتە روو، کە دراوێکی رۆمانیە ولەسەریدا یەکێکی ریش دار نەخشێندراوە.

هەروا لە رووبەرێکی دوور ئاسەوارەکانی بابل دەبینی لەشاری حلەدا، لەوکاتەی لە بەغدا بووم تێبینی ئەوەم کرد کە سوپای تورکی لەشەش هەزار سەرباز پێکهاتبوو وهەمووشیان لەسەر کەناری دیجلەدا مۆلگەیان دانابوو، دیمەنێکی زۆر جوان بوو لەکاتی رۆژهەلاتدا کە ئەو سوپایە دەپەڕیەوە، کاتێك کە گەیشتمە بەغدا بینیم هەزاران مەڕومالات بەرەو بەغدا دەهات، دیارە هەموو ئەو مەڕ ومالاتانەش مولکی ئەو عەرەبانە بوو کە لەسوپای تورکی یاخی بوو بوون.

باسیش لەوە دەکرێ کە شاری بەغدا خاوەن گەنجینەیەکی زۆرە لەزێڕ وزیودا بەتایبەتی لە گەنجینەی (کخیا)، کە لەسەر دەستی پیلانگێڕاندا کوژراوە، ئەوەش دەخرێتە روو کخیا لەلایەن زۆرێك لە وەزیر وپاشاکان ئازار دراوە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە تورکەکان خەلکیان زۆر چەوساندۆتەوە، لەبەرامبەریشدا ئەوەش دەگوترێ کە کخیا یەکێك لەو کەسانە بووە لەزۆر رووەوە ژیر ولەسەرخۆ بووە بەرامبەر هەموو کارەکان وهەموو کاتێکیش زۆر متمانەی بە پاشا هەبووە، بەلام هەندێك لە ئەفسەرەکان پیلانیان دژی گێڕاوە ودواتر مردووە، دیارە ئەو کات هەموو بازرگانەکان سیخوڕیان لە دەوری خۆیاندا کۆکردۆتەوە تاوەکو بتوانن بازاڕ کۆنترۆل بکەن، ئەمەش بووە هۆکارێك دژایەتی لەنێوان زۆر بەرەی بازرگانەکاندا هاتە کایەوە، لەهەمووی سەیرتر کخیای ئێستا هیچ خوێندەواری نییە وئەویش لەرەچەلەکەدا جۆرجیە، سەرتا لە حەرەم کاریان پێکردووە ولە دواتریشدا پۆستێکی بەرزیان پێ بەخشی لەیەکێك لە دەستە سەربازییەکان، بەلام زۆری نەبرد باس لەوە کرا کە کچی پاشا دەیەوێ شووی پێ بکا، دواتر توانی کاریگەری هەبێ لەسەر زۆرێك لەئەفسەرەکان بۆ ئەوەی کخیا بکوژن لە کاتی ئێوارەدا کە لەدیوانەکەی دەگەڕایەوە مالەوە، ئەم کارە وایکرد ماوەیەك لەنێو بەغدا قسە وقسەلۆك پەیدا بوو وپشێوی هاتە ئارا، بەلام ئەمە زۆری نەبرد، دۆخەکە هێمن بۆوە، بەلام دوا کارەسات کەرووبەڕووی شارەکە بۆوە، کوشتنی شێخ سوینی بوو لەنێوەندی رەشمالەکەیدا، ئەمەش بیانووی سوپای تورك بوو تا رێگری لەگەشەسەندنی وەهابیەکان بکات.

لەلایەکی دیکەوە ژمارەیەکی کەم لە بازرگانە ئەورووپییەکان لە بەغدا دا بازرگانی دەکەن، بۆ نموونە لە شاری بەغدا کونسلگەری ئینگلیز نییە، بەلکو لەلایەن (خوجە مایکل)ی ئەرمەنی کارەکانی کونسلگەری بەڕێوە دەبرێ، ئەو پیاوێکی زۆر بەڕێزەوە، هاوکات من نامەیەکم پێ بوو بۆ ئەرمەنیەکی دیکە کە ناوی خۆجە ئەستیفان بوو، ئەو یەکێك بوو لە دەوڵەمەندەکانی ئەو شارە ئینگلیزیەکی باشی دەزانی، هەروا ئەو تاکە کەس بوو لەو شارەدا زمانی ئینگلیزی بزانێ، بەڵام فەڕەنسیەکان لەکاتی ئێستادا کونسلگەرێکیان لەبەغدا هەیە، کە یەکێك لەخزمەکانی جاك جاك ر ۆسۆیە، بەڵام فەڕەنسیەکان لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەکی فراوان بازرگانیان نەدەکرد، بەڵام لەبەسرا ژمارەیەك لەفەڕەنسیەکان کاری وەرگێڕانیان نەدەکرد بۆ هەندێك لەوانەی دەیانەوێ گەشت بەو وڵاتانە بکەن، لەلایەکی دیکەوە رینو تەنها نووسەرێك بوو لەلای مستەر مانستی، مانستی باس لەوە دەکات کاتێك ویتسویەتی سەردانی پاشا بکا لەرێگەدا گوێی لەهەندێك کەس بووە هاوار وگریانیان ئەو ناوەیان هەراسان کردووە، دیارە هەموو ئەو کەسانەش ئامادە کرابوون لە سێدارە بدرێن، بەڵام لەپێشتردا بەقامچی هەموو لەشیان هەنجەن بەهەنجەن کردبوو، لەوێدا داوای لەپاشا کردبوو کە هیچی تر لەو کەسانە نەدەن، چونکە ناتواندرێ گوێت لە گریان وهاوار بێت، بۆیە پاشا لەسەر داوی مستەر رینۆ ومانستی وازیان لێبێن ولەسێدارە نەدرێن، بەڵام بهێندرێتە ماڵەکەی ولەژێر هەڵسوکەوتی پاشادا بێ، مستەر رینۆش وەك چۆن ئینگلیزی دەزانێ، ئەوها عەرەبی دەزانێ، بەڵام دوای ئەوەی بەندیەکانیان هێنا پاشا بڕیاری ئازاد کردنیانی دا، ئێستاش ئەو کەسانە بەئازادانە دەژین لەماڵەکانی خۆیاندا.

لەوکاتەدا کابتن رید زۆر نەخۆش بوو وئومێدی ئەوەش نەبوو وا بەئاسانی چاك بێتەوە، بۆیە خۆم ئامادە کرد تاوەکو بەغدا بەجێ بهێڵم، مستەر رینۆش توانی رێگەپێدراو (فەرمان)ێکم بۆ دەر بکات ولەگەڵ یەکێ لەتەتەرەکان بەناوی (سەید ئەحمەد ئاغا) لەگەشتەکەمدا یاوەرم بێ، ئەو تەتەریە هەموو پیداویستیەکانی گەشتی بۆ کردم وەك ئەسپێك بۆیە خۆم ئامادە کرد بۆ گەشت، لەبەر ئەوەی لەرێگەی کونسلگەرەوە ئەو گەشتە بکەم، بۆیە دەبوایە جلوبەرگێك لەبەر بکەم، لەگەڵ تەتەری هاوڕێم رێکەوتم کە هەشت قورشی پێ بدەم لەبڕی ئەوەی هاو

گەشتەکەمە، ئەو جلوبەرگانەی  من پۆشیم پێکهاتبوو لە تەربووشێکی زەرد پێیەك بەرز بوو، ئەم تەربووشە بەهایەکی زۆری هەبوو، چونکە بۆ پاراستنی سەرت لەهەر تەقەی چەکێك دەیپاراستی، ئەوە جگە لەوەی ئەو تەربووشە کێشی زۆر قورس بوو، لەسەرەتادا وا دەزانی ناخۆشە، بەلاّم دواتر لەسەر کردنی خۆش بوو، ناویش لەو تەربووشە نرابوو (قولباق)، تەنهاش تەتەریەکان لەسەری دەکەن.
بەلاّم جلوبەرگەکانی دیکەم پێکهاتبوو لەقوماشێکی حەریری فراوان، لەگەلّ جاکەتێك، لەگەلّ شەروالێکی تورکی رەنگ شین، ئەوە جگە لەپێ کردنی یەك جووت پێلاّوی رەنگ سوور، ئەمەش زۆر باشە بۆ رۆیشتن وهەگاو نان، لەلایەکی دیکەوە لەلای تورکەکاندا مل بەرووتی دیارە وبەهیچ قوماشێك داناپۆشرێ، لەگەلّ هەر هەموو ئەمانەش پشتێکی قایشم لەدەوری ناو قەدم ئالاّند وقایشەکە شوێنێکی هەبوو تا شیرێکی پێ هەلّواسی وشیرەکەم بەقەدمەوە بوو، هەموو جلوبەرگ وکەلوپەلە تایبەتەکانی خۆم لەنێو سندوقێك دانا، بەلاّم قەمیس وگۆریەکانم لەژێر سەرج وقایشی ئەسپەکەدا شاردەوە.

من ورێبەرەکەم خۆمان ئامادە کردوو وهەموو پێداویستەکانمان ئامادە کرد، ئەمەو لەکاتژمێر پێنجی رۆژی پێنجشەمی بەرواری بیستی تەموز چەند ئەسپێکیان بۆ ئامادە کردین، کاتی ئەوە هات تا بچمە لای هاورێیەکانم تا پێیان بلێم من سەفەر دەکەم، کابتن رید لەو کاتەدا زۆر نەخۆش بوو، کەبینیم بەدەست خۆم نەبوو، فرمێسك لە چاوانم هاتە خوارەوە، نەخۆشیەکەشی بەهۆی توند وتیژی گەرماوە بوو، وەك خۆی باسی کرد هەموو لەشی لە ئازاردایە، ئەو لە زۆرێك لە گەشتەکانم هاورێم بووە، کاتێك کەبینیم هیوایەکی کەمم هەبوو جارێکی دیکە ببینمەوە.

بەخومان ئەسپەکەمان بۆ ماوەی کاتژمێرێك بەناو بازاردا هاتوچۆمان کرد، چونکە زۆربەی بازرگانەکان سەبارەت بەگەشتەکەی من زانیاریان هەبوو، بۆیە هەر یەکەو نامەیەکی پێبوو تا بیگەیەنینە شارەکانی دیکە، من دلنیام ژمارەی نامەکان زیاتر لەدوو سەد نامە بوو، ئەو جۆرە گەیاندنەش تاکە رێگە بوو تا نامە لەشارێکەوە بۆ شارێکی دیکە بچێ، هاوکات تەتەر وبازرگانەکان لەسەر ئەو بابەتە کۆك بوون، هەردەم نووسینگەی تەتەریش جێگەی متمانە بوو وکرێیەکانیشان لەهەموو ئەو بازرگانانە وەردەگرت کە نامەکانیان لێیان وەردەگرت، لەگەڵ ئەوەی تەتەریەکان بۆ گەیاندنی ئەو نامە هیچ تێچوون وبڕە پارەیەکیان نەدەچوو، ئەمەو هەموو بازرگانەکان لەشارەکانی دیکە نزیکی گەڕیدە وگەشتەوانەکان دەبوونەوە تا نامەی لێوەربگرن، لەنزیك دەروازەی رۆژئاوای بەغدا بینیمان کاروانێك خۆی ئامادە کردبوو بۆ گەشت وسەفەر کردن، کە پێکهاتبوو لەسەدان حوشتر، کاتێك هەنگاومان نا بەشی یەکەمی رێگەکەمان بیابانێکی وشك وبرینگ بوو شوێنەواری هیچ کشتوکاڵێکی تیادا نەبوو، کاتێکیش کە چوار میلمان بڕی خزمەتکاری رێبەرەکەمان سێ ئەسپی پێداین وکەخۆی سواری یەکێکیان بوو وهەموو جلوبەرگە ئەورووپیەکانمی لەسەردا بەستایەوە، بەڵام ئەسپی دووەم تەنها وەك یەدەگ بەکار دەهات تا هەر کاتێك هەر رووداوێك بێتە ئارا ئەوا

ئەو ئەسپە بەکار بهێنین، سێیەمیش دوو باڵەی کەلوپەل بوو، ئەمەش بەپێی ڕێکەوتنی من وڕێبەرەکەمان نەبوو، بۆیە خۆم لەزۆر شت بێبەش کرد، ئەوا دەبینی ڕێبەرەکەمان هەر لەسەرەتاوە دەستی بەفرت وفێڵ کر دن کرد، بۆیە بیرم لەوە کردەوە بگەڕێمەوە بەغدا ولەپای فرت وفێڵەکانشی قەرەبوومان بکاتەوە، بۆیە هەڕەشەی ئەوەم لێکرد کە دەگەڕێمەوە بەغدا، ڕێبەرەکەمان بەو قسەیە زۆر تێکچوو، چونکە کارەکەی هەموو بەفیڕۆ دەڕۆیشت ودەبوایە هەردوو باڵەکە بگەیەنێتە شوێنێك کە لە مووسڵ دوور ترە، لەگەڵ ئەوەی ئەو هەڵویستەی ر ێبەرەکەم گەلێك لا ناخۆش بوو، کەچی پێنجسەد قروشم پێدا، بەڵام ئەویش بەڵێنی کە بەخێرایی ڕێگەکان ببڕێ، لەدووری نۆ میل لە بەغداوە ویەکێك لەکەنار وجۆگەکانی زێی دیجلەمان بڕی، ئەو شوێنە پڕ لە دڕهك وداڵ بوو ولەکاتژمێر دە بەتەنیشت شاری (ینکجە) کە ئێستا بەناوی ئاغاکان ناونراوە تێپەڕین، ئەو شارە وا دەبیندرا تەنها مەڕومالاتیان بەخێو دەکرد، کە شوانکاریەك لەدوورەوە پاسەوانی دەکرد، ئەویش لەترسی دڕەندە وگورگەکان دواتر یەکێك لەگرد وبانەکانی ڕۆژئاوای شاری (ینکجە)مان بڕی، لەگەڵ ئەوەی لەنێوان کاتژمێر دە ویازدەی شەودا بووین، بەڵام من هێشتا زۆرم گەرما بوو، لووتم خۆم بەپارچەیەك قوماش گرتبوو، هاوکات ڕێبەرەکەمانیش هەمان کاری کرد، پاش ئەوەی ڕزگارمان بوو لە تۆز وبا، ئەگەر تۆزەکە بەمشێوەیە بەردەوام بێ، ئەوا لەوانەیە کارەساتێك بێتە کایەوە، چونکە لەکاتی ڕۆژدا تۆزەکە بەم جۆرە بێ وتوندی گەرماش لەو پەڕی دابێ زەوی لەهەموو ڕوویەکەوە دەسووتێ.

بەماوەی کاتژمێرێك بەتێکڕایی پێنج میلمان دەبڕی، لەکاتژمێر یانزدە گەیشتینە شارۆچکەیەك بەناوی (دۆکلە) لەوێدا لەسەر زەوی پاڵمان دایەوە ونووستین بەبێ ئەوەی جلوبەرگەکانمان لەبەر بکەینەوە، ئەمەو لەدەوروبەری وینکجە چەندین گوندمان لەسەر ڕێگەدا بینی کە خانووەکان بەقوڕ دورستکرا بوون ولەنێوان هەر خانوویەك دیوارێك هەبوو.

لەکاتژمێر چوار ونیوی بەیانی ڕۆژی هەینی بیست ویەکی تەموز هەڵساین، زۆری نەبرد یەکێك لەتورکەکان بەخۆی وخزمەتکارەکەی وسێ ئەسپەکەی لێمان

نزيك بۆوە، بەچەندین گونددا تێپەڕین ولەنێوەندی ئەو دیهاتانە چەندین دیمەنی
کێڵگە ودەغل ودانمان بینی، ئەو جگە لەو کەناڵ وجۆگە وپردەکات کە
بەشێوەیەکی ساکار بنیات نرابوو، لەوکاتەدا کابرای تورك کارایی خۆی نیشانمان
بدات بۆیە زۆر بەخێرایی بەسەر پردێکدا تێپەڕی، بەلام کە پەڕیەوە زۆر بەخراپی
بەر بۆوە وزۆری نەمابوو پێیەکی بشکێ، کاتێك دەستمان بە
سەفەرەکەمان کردەوە تێکڕایی ڕۆیشتنەکەمان لە کاتژمێرێکدا چوار میلمان
دەبڕی، ئەمەو تا کاتژمێر شەش ونیو ڕێگەمان بڕی تا گەیشتینە گوندی (هۆب)
کە لەوانەیە (گوندی هبهب) بێ.

لەوێدا دەستمان بەنان خواردن کرد کە پێکهاتبوو لە ماست وهێلکە ودواتر
کەمێك لەژێر سێبەری گەڵای دارەکاندا پاڵم دایەوە، کەنزیکی جۆگەیەك بوو
وئاوەکەی زۆر سارد وسازگار بوو، دواتر لە کاتژمێر چوار ونیوی دوای نێوەڕۆ
دەستمان بەسەفەرەکەمان کردەوە، لەرێگە شارێکمان بینی بەناوی (ماسباس) کە
لەنزیك زێی دیالەدا بوو، ئەمەو بینیمان ئەم ناوچەیە پاشماوەی سەربازگەکان بووە،
هەر لەوێدا چەندین بەرازی دڕندەمان بینی، لەکاتی رۆژئاوا بووندا یەکێك لەو
بەرزانە خۆی لێمان نزیك کردەوە، کە ئێمەشی بینی پێی سەیر نەبوو، کاتێك
لەسەر ئەسپەکەم بووم ویستم هێرش بکەمە سەری، بەڵام ئەوەی سەیر بوو
بەرازەکە خۆی لەدۆخێکی بەرگری کردن لەخۆی دانابوو وبۆیە تەنها سەری رووی
لەمن بوو ودواتر بەسەری بەرەو رووم هات، لەو کاتەدا بیرم لەوە کردەوە کە
پاشەکشە بکەم، لەگەڵ ئەوەی شیر وتفەنگم پێ بوو، بەڵام لەو بڕوایە دابووم کە
ناتوانم رووبەڕووی ئەو دڕندە گەورەیە ببمەوە، بۆیە وازم لەو بەرازە هێنا، ئێمە
لەکاتژمێرێکدا بەتێکڕایی پێنج کاتژمێر ڕێگەمان دەبڕی، لەکاتژمێر نۆ ونیو
گەیشتینە گوندی (جبقان)، ئەو شەوەش لەوەێدا لەسەر زەوی نووستین
وپاڵماندایەوە، کاتێك دەستمان بەسەفەرەکەمان کردەوە لەکاتژمێر چوار گەیشتینە
سەر زێی دیالا کە بەسەر پردێکدا پەڕینەوە گەیشتینە گوندی (دیال عەباس)،
کاتێکیش کە رۆژ بۆوە بینمان عەرەبەکان لە نێوان گوندی جبقان وئەو شوێنە
بەسەر ئەسپەکانیانەوە هاتووچۆ دەکەن، بەڵام بەهیچ شێوەیەك رووبەڕوومان

نەدەبوونەوە، تەنهاش سلاومان لێك دەكرد، دووبارە دەستمان بەخواردنی نان وماست كردەوە كە لەلای من خواردنێكی خۆش بوو، ئیتر بەمشێوەیە رێگەمان دەبڕی ولەسەر كەناری زێی دیالا رۆیشتین تا گەیشتینە گوندی (ئەدناك) ئەمەش لەكاتژمێر شەشدا، ئەم شارۆچكەیەش دەكەوێتە سەر بەرزاییەكی زنجیرە چیایەك كە درێژە دەكێشێ لە رۆژهەلاتەوە بۆ ر ۆژئاوا، هەموو كانی ورێڕەو وجۆگەكان لە چیاكانەوە دێ ولەوێدا باڵندی لەقلەق بەزۆری دەبیندرێ، بەلام هەموو باڵندەكان ماڵین، هەردەم گوێت لەدەنگ لەقلەق دەبوو، كاتێكیش كە (ئەدناك)مان بەجێ هیچشت كاتژمێر چوار ونیو بوو، ئەمەو بەسەر چیایەكان كەوتین ولەرێگە باریك وتەسكەكانی چیادا هەنگاومان دەنا، لەنێو ئەو چیایانەدا رەشماڵێكی عەرەبەكانمان بینی كە چەند پیاوێكی تیا بوو هەموویان بەچەكەوە لەدۆخی تەقە كردندا بوون ورێبەرەكەی ئێمەیان راگرت چەند قروشێكیان لێ وەر گرت، كاتێك هەموو چیایەكمان بڕی گەیتشتینە دۆڵێكی فراوان كە زێیەكی بەناودا تێدەپەڕێ كە دانیشتووانی ئەو ناوچەیە ناویان ناوە (زێی نارین)، لەوێدا بینیمان چەندین كەس بەخۆیان مێگەلەكانیان لەنزیك ئەو زێیەدان، هەروا لەو ناوچەیەدا چەندین ئاژەڵ دەبینی وەك كەروێشك كە پێی دەچێ هەموو ئەو ئاژەلانە ماڵی بن، گەشتەكەمان بەردەوام بوو ئەمەو لەكاتژمێرێكدا سێ میلمان دەبڕی ولەكاتژمێر یەك گەیشتینە شارۆچكەیەك كەپێی دەڵێن (قەرەتەپە) لەوێشدا وێبەر وخزمەتكارەكەی ئێمەیان بەجێ هێشت، كە لە بەغداوە لەگەڵمان هاتبوون، بەلام هەتا ئەو كاتەش تورك وخزمەتكارەكەی یاوەرمان بوون، دووبارە دەستمان بە بەردەوام بوون كرد، بەلام ئەمجارەیان بە ئەسپی دیكە، كاتێك كە قەرەتەپەمان بەجێ هێشت لە زۆر شوێندا رێگە سەخت وناخۆش بوو، وەك ئاساییە دەبێ یەكێك لە خزمەتكارەكان بەسواری ئەسپەكانیانەوە وئەسپێكی دیكەیان لەتەك بێ واتە دوو ئەسپ، لەو كاتەدا یەكێك لە خزمەتكارەكان لە ئەسپەكەی من نزیك بۆوە ودەیویست بەقامچی لە ئەسپەكەم بدات، بەلام من پێم باش نەبوو یەكێكی دیكە ئازاری ئەسپەكەم بدات، بەلام من سوڕامەوە قامچیەكم لە خزمەتكارەكە دا، ئەمە هەڵەیەك بوو لەمنەوە هاتە ئارا، بەلام دواتر ئەمە وایكرد خزمەتكارەكان بەقامچی لە ئەسپی كەس نەدەن،

لەرێگەدا گەلێك رەشماڵمان بینی کە هەموویان بۆ ئەوە لەوێ بوون تا چەند قروشێك لەگەشتیاران وگەڕیدەکان وەربگرن، لەکاتژمێر دوو ونیوی شەو گەیشتینە (کۆپری) پاش ئەوەی زێی نارینمان بڕی، ئەمەش بەهۆی پردێك کە لەسەر زێیەکەدا بوو وبەبەرد هەڵچێندرابوو، پاش پشوویەك دووبارە لەکاتژمێر چواری بەیانی دەستمان بەسەفەرەکەمان کردەوە لەوێدا بەنێو خاکێکی رووتدا تێپەڕین کە ئاسەواری هیچ کشتوکاڵێکی تیا نەبوو، دواتر سوڕاینەوە بەتەنیشت ئەو زنجیرە گردەلۆکانە تێدەپەڕین کە بەلای رۆژهەڵاتەوەیە، ئێمە هەمیشە ئاگاداری ئەوە بووین لەرێگەدا رووبەڕووی هیچ رووداوێك نەبینەوە، لەگەڵ ئەوەی لە زۆر شوێندا رێگە زۆر باش بوو بۆ رۆیشتن، هاوکات لە کاتژمێر شەش ونیو گەیشتینە (توزخورماتوو)، لەوێشدا پێمان باش بوو پشوویەك بدەین.

شاری توزخورماتوو دەکەوێتە باکووری شاخەکانەوە وئاودێریەکی زۆر باشی هەیە کە لە شاخەکانەوە چەندین وکانی وکەناڵ وجۆگە ئاوڕێژی دەکا، هاوکات ئەو شارە دەڕوانێتە دۆڵێکی فراوان کە تاوەکو باشوور دەڕوا، لەکاتی زستاندا گیایەکی زۆری لێیە، دەوتوانین بڵێین تا ئێستا پاشماوەی وەرزی زستانی بەسەرەوە دیارە، لەگەڵ ئەوەی لەو وەرزەدا تیشکی رۆژ لەوێدا زۆر بەهێزە، بەهۆی توندی ئەو گەرمایەش زۆربەی کێڵگە وکشتوکاڵەکان لەناو دەچن، کە لەنزیك ئاو وئاوەڕۆکاندایە کە ئاوەکەی لەچیایەوە دەڕژێتە ناوی، هاوکات لەوێدا مێگەلی مەڕ ومالاتێکی زۆرمان بینی، وەك دیاریشە ئێوار ان ئەو مێگەلانە دەگەڕێنەوە لەترسی ئەوەی نەوەك ئاژەڵە دڕندەکان رووبەڕوویان ببنەوە، لەلایەکی بەدرێژایی ئەو دۆڵە کە زیاتر لە پازدە میلە شوێنەواری نیشتەجێ بوونی دانیشتوانمان نەبینی، لەو شوێنەی کە لێی دابەزین خەڵکەکەی زۆر رێك وپێك وباش بوون، لەلایەکی دیکەوە ئەوی سەیر بوو لەوێدا ئەگەر یەکێك لەخزمەتکارەکان شتێکی پشتگوێ خست ئەوا رێبەرەکەمان پێی ئاسایی بوو بەقامچی لەخزمەتکارەکە بدات.

لەوێدا گۆشتی مامز و مریشك خۆشترین خواردنە، هەروا نانیان لەشێوەی پارچە پارچە دەچوو، لەگەڵ ئەوەشدا خواردنی من تەنها نان وماست بوو، هەروا

گوشتی بەرخ زۆر خۆش بوو، هەردەم پێشکەشی بێگانەیان دەکرد وبەخۆیان زۆربەی دونەگ وبەزیان دەخوارد، لەکاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆی توزخورماتوومان بەجێ هێشت و هەموو گوندەکانی سەر رێگە وشك وبرینگ بوون، تا ئەو کاتەی گەیشتینە شارێك کە پێی دەڵێن (تاووق)، (لەوانەیە نووسەر گوندێکی کەمێك گەورەی بەشارۆچکە لەقەڵەم دابێ-وەرگێڕی کوردی)، هاوکات لە کاتژمێر شەش ونیو گەییشتینە تاووق، تاووق دەکەوێتە باکووری دۆڵێکی فراوان لەهەموو لایەکی زنجیرەیەك چیای لەدەورە کە لەرۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا دەکشێ، لەلایەکی دیکەوە کاتژمێر هەشتدا لە تاووقەوە تا شاری (تبللی) لەیلان چوار میلمان بڕی، ئەویش لەهەمان دۆڵدایە ولەچیاوە ئاو وکانیەکاتی دەڕژێتە ئەو ناوچەیە، لەو شارە نەوەستاین وبەڵکو بەردەوام بووین وچوار میلی دیکەمان بڕی، بەڵام رێگە زۆر سەخت ناخۆش بوو لەهەندێ کاتدا، لەو شەوە تاریکانە هەموو کات بۆچوونم وابوو کە دوژمنەکان لە رێگەدان، چونکە رێگەکە زۆر ترسناك بوو، بۆیە لێ نەدەگەڕام رێبەرەکەمان بەخێرایی بڕوا، هاوکات لەکاتی رۆژدا پێم ئاسایی بوو زۆر بەخێرایی بڕۆین، هاوکات ئەوەی زانراوە تەتەریەکان لە هاژووتنی وسواربوونی ئەسپ زۆر کاران وگوێیان نەدەدا تا ئەو کاتەی ئاژەڵەکان دەمردن، ئەوە جگە لەوەی ئەسپەکانی ئەم وڵاتە زۆر باشترن لە ئەسپەکانی ئەورووپا، چونکە ئەسپەکاتی ئێرە زۆر بەکەمی ماندوو دەبن، هەروا ئەوانە سواری ئەسپ دەبن زۆر بەکەمی لەکەوتن لەسەر ئەو ئەسپانە دەترسن وچونکە ئەو جلوبەرگانەی پۆشیویانە دەیانپارێزێ، ئەسپەکانیش لەسەرەوە سەرجێك هەیە ولەژێر پێیانەوەش ناڵ هەیە، کە بریتیە لەپارچەیەك ئاسن بەدرێژی بن پێ.

زۆر بە سانایی تا کاتژمێر دووی رۆژی دووشەممەی بەرواری بیست وچواری تەموز هەنگاومان نا، لەوێشدا گەیشتینە شاری کەرکوك، ئەو شارەش دەکەوێتە هەمان دۆڵ کە پێشتر باسمان کرد، کە لەلای راستەوە بەسەر زنجیرەیەك دەکەوی، هاوکات لەسەر لەسەر چەند بەرزاییەك چەندین بیری نەوتمان بینی، (ئەو شوێنەش ئێستا پێی دەڵێن باباگوڕ گوڕ)، هەر بیرێکیش سێ پێ قووڵ بوو ونەوت لەوێدا گەلێك زۆرە وئەمەو نەوت لەشلەیەك پێك دێ وکە

بۆنەکەی زۆر ناخۆشە، هەروا لەسەر ئەو بیرانە چەندین بەردی گەورەمان بینی پارچەیەك خویٚ بوو.

دواتر خۆمان لەنێوەندی چەندین گردەلۆکە وشاخدا دۆزیەوە کە بەهۆی ئاوەوە شێوەیەکی جوانی بەخۆیەوە گرتبوو وەك سەدەف وبەردی رەنگاو رەنگ، هاوکات دوای هەنگاونانمان چووینە نێوەندی دۆڵێکی پان وبەرین، ئێمە ئەو دۆڵەمان بەگەورترین فریاکەوتن لەقەڵەم دا، چونکە بەسەرکەوتنی گرد وشاخەکان لەهەندێك رووبەرووی ناخۆشی دەکردینەوە، لەوێدا ئەسپەکانمان نەیان دەتوانی جێی پیٚ خۆی بکاتەوە، لەهەندێك شوێنیشدا ئەو گرد وشاخانانە وەك گیایی وشك بوو، بەڵام دیمەنێکی دەگمەن بوو لەجوانی، کە لەماوەی چاودا درێژ بوو بۆوە لە رۆهەڵاتەوە تا رۆژئاوا، ئەوەی دەردەکەویٚ ئەم زنجیرە گردەلۆك وشاخانە دیوارێکی سروشتی پێکهێنابوو، ئەوە جگە لەوەی پاشماوەی دیوارێك لەو ناوچەیەدا بەدەردەکەوت، پاش ئەوەی گەیشتینە دۆڵەکە وزۆربەی رێگەکەمان بڕی گەیشتینە (ئاڵتون کۆپری) (پردیٚ)، کاتێك گەیشتینە ئاڵتون کۆپری بینمان شارۆچکەیەکی گەورەیە ودانیشتووانێکی زۆری تیادا نیشتەجێیە، ئەم شارەش لەسەر دوورگەیەك دامەزراوە کە زێی (ئاڵتون) بەنێویدا تێپەڕ دەبیٚ ودواتر بەرەو باشووری دوورگەکە دەڕوا، ئێستا لەوێدا سەربازگەیەکی گەورەی تورکەکان لەوێدا جێگیر کراوە، کە بەچەندین قەڵای پتەو دەور دراوە، دوای ئەوەی بەسەر پردێکی بەبەرد هەڵنجراو تێپەرین چووینە ناو شارۆچکەکە، ئەوەی شیاوی باسە ئەم پردە گەورەترین پردە کە لەژیانمدا بینیوومە، لەلایەکی دیکەوە ئەو پردە لەزۆر شوێندا چاڵی تیادا هەیە، چونکە چەند جارێك زۆری نەمابوو ئەسپەکەم بکەویٚ، ئێستاش ئەم شارە بە پایتەختی کوردستانی تورکیا دەژمێردریٚ، پاشاش لەوێدا دەسەڵاتی لەدەستە (مەبەستیش لەکوردستانی تورکیا هاتنی ئەو تورك وتورکمانانەیە کە لەو شارەدا نیشتەجیٚ بوونە، ئەمەش لەسەردەمی سلێمان قانوونیەوە-وەرگێڕی عەرەبی)، بەڵام ئەوەی ئێمە بزانین (ئەم شارە تەنها چەند بنەماڵەیەکی تورکمانی تیادا نیشتەجیٚ بوونە وخەڵکەکەی دیکە لەوانەوە فێری تورکمانی

بوونه وئەگینا خەڵکی ئەم شارە هەموو لەرەچەڵەکی کوردن، سەبارەت بە پایتەختیش لەوانەیە جاکسۆن ئەو شارەی زۆر لا جوان بووە، چونکە شوێنێکی ستراتیژی هەیە-وەرگێڕی کوردی).

کاتێك کە ئاڵتون کۆپری-پردێمان بەجێ هێشت چەندین گوند ودیمەنی جوانمان بینی، ئەوە جگە لەچەندین کێڵگەی کشتووکاڵ وگەنم وجۆ، ئەو گەنم وجۆیانەش کاتی ئەوە بوو تا بدورێتەوە.

لەلایەکی دیکەوە لە سەر چەندین گردەلۆکەدا چەندین کێڵگەی کشتوکاڵمان بینی، تا گەیشتینە (اربیل-هەولێر) کە سی ودوو میل لە ئاڵتون کۆپری — پردێیەوە دوورە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە هەولێر لەرابردوودا گرنگیەکی مەزنی هەبووە، بەتایبەتی بەبوونی ئەو قەڵا پتەوەی کە لەسەر لووتکەی گردێك دورستکراوە، ئەوەی دەبیندرێ ئەو شارە چەندین بیری نەوتی هەیە (بەپێی سەرچاوەکان لەهەولێر ودەوروبەری نەوت نەبیندراوە وئینگلیزەکانیش لە شەڕی دووەمی جیهاندا، کە ئینگلیزەکان کاریان لەگەڵ کۆمپانیا نەوتیەکان کردووە، بیری نەوت وشوێنی نەوتیان بەدی نەکردووە، ئەمەش لەنێوەندی گەڕانەکانیاندا-وەرگێڕی عەرەبی).

باسیش لەوە دەکرێ کە لەنزیك هەولێری کۆندا ئەسکەندەر لەگەڵ داریۆسدا جەنگاوە، گوندەکانی دەوروبەری گۆڕەپانی جەنگ بووە.

لەهەولێر نەوەستاین، بۆیە بەردەوام بووین لە گەشتەکەمان وچوار میلی دیکەمان بڕی تا گەیشتینە شارۆچکەیەك بەناوی (عین کاوە) وزۆربەی رێگەکەش زۆر خۆش بوو، لەکاتژمێر یەك ونیوی بەیانی رۆژی سێشەممەی بیست وپێنجی تەمووز عینکاوەمان بەجێ هێشت وزۆر بەخێرایی تا کاتژمێر پێنج گەیشتنینە شارۆچکەیەکی بچووك بەناوی (کەڵەك) کە دەکەوێتە سەر کەناری زێی زاب، لەوێدا بینیمان یەکێك لەکاروانەکان چاوەڕێی پەڕینەوە بوو وپەڕینەوەش کاتێکی دەویست، چونکە هیچ بەلەمێك لەوێدا نەدەبیندرا، ئەمەو ئەسپ وحوشترەکان سێ تا چوار بە مەلەکردن لەئاودا دەپەڕینەوە کە یەکێك لەپیاوەکان سەرپەرشتی دەکرد، کە لەژێر سینگ وباڵیدا پێستێکی بازنەیی دادەنا، هاوکات کەلوپەلی

گەشتیاران وگەڕیدەکان بەنێو ئەو دڕك ودالّە وشکانە دەبرا کە لەم بەر وئەوبەری زێیەکەدا هەبوو، ئەویش بەهەمان ئەو پێستە بازنەییە، ئێمەش بەمشێوەیە زێیەکەمان بڕی وزۆرێش چاوەڕێمان نەکرد، چونکە ئەوانەی سەرپەرشتی پەڕینەوەی کاروانەکانیان دەکرد، کاتێك زانیان ئێمە بیانین ویەکسەر ئێمەیان پێش خست بۆ پەڕینەوە.

زاب زێیەکە ئاوەکەی زۆر سازگارە ولەو چیایانەوە دێ کە دەکەوێتە باکوور ولووتکەکەیان هەمیشە بەفری لەسەرە، پێدەچێ ئەو گوندانەی دەوروبەری ئەو زێیە زۆرێك لەبەرهەمی دانەوێلە بەرهەم بهێنن، ئەمەش بەهۆی ئاوڕێژ وکەناڵ وجۆگەی ئەو زێیە کە لەزۆر شوێندا بەکار دێ، کاتێك لەسەر ئەسپەکانمان بوو زۆر بەخێرایی هەنگاومان دەنا وپێنج میلمان بڕی تا گەیشتینە زێیەکی دیکە بەناوی (خازر)، لەگەڵ ئەوەی ئەو زێیە وەك زێی زاب یان زێی گەورە مەزن نەبوو، بەڵام تووشی زۆر ناخۆشی بووینەوە تا پەڕینەوە، ئەمەش بەهۆی توانەوەی بەفری چیاکان وهاتنە ئارایی لافاو.

لەوێشدا زۆر بەخێرایی دەڕۆیشتین ولەرێگەدا چەندین دێهات وگوندی ڕەنگیمان بینی وبەهۆی خێرایی ڕۆیشتنمان شەش میلمان بڕی ولەکاتژمێر هەشت گەیشتینە شاری (قەرەقۆش).

ئەسپەکانمان لەوێدا ئامادە نەبوون هەنگاو بنێن، بۆیە دەبوایە کاتژمێرێك بوەستین، لەگەڵ ئەوەی من زۆر حەزم لێ بوو بەیانی بگەمە مووسڵ، بەڵام من گومانم دەکرد کە بەرۆژێکی دیکە نەگەمە مووسڵ، لەگەڵ پاش کاتژمێرێك ئەسپەکانیان بۆ هێنانیەوە لەپاش کاتژمێر نۆدا، بەڵام لەو کاتەدا توندی گەرما زۆر بەهێز بوو وزۆربەی خەڵك لەسێبەرەکاندا پشوویان دەدا، ئەوە جگە لەوەی هەندێك دەچوونە سەردابەکان تاوەکو گەرما پەییان پێ نەبا، ئەم بەشەی ئەم وڵاتە زۆر ترسناکە ئەمەش بەهۆی ڕەشەبای سمێڵ بەناوبانگ، ئێستاش گەرمی ورەشەباکەی زۆر بەهێزە، زۆرێك لەخەڵکیش بەهۆی ئەو گەرمیەوە تووشی زۆر نەخۆشی دەبوونەوە ودەمردن، من ورێبەرەکەم خۆمان بەشێوەیەکی گونجاو ئامادە کرد وزۆربەخێرایی ئەو شوێنەمان جێ هێشت وکە دووریەکەی نزیکەی بیست میل

دەبیٚ، خێرا بووین لەرۆیشتندا،چونکە رەشەبای سمێڵ زۆر توندتر دەبوو، کاتێکیش کە نزیکی مووسڵ بووینەوە، دیارە لەوێدا پلەی گەرمی بەرزتر دەبێتەوە، من گومانم نەبوو لەوەی، کە ئەگەر کاتژمێرێکی دیکە نەگەین وئەوا خۆمان وئاژەڵەکانمان رووبەڕووی سەختی دەبینەوە وهاوکات رووبەڕووی زۆرێك لەناخۆشیەکان بووینەوە، بەهۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی ورەشەباوە.

کاتژمێر یانزده چارەگی بویێ لەکاتی بەیانی رۆژی بیست وپێنجی تەموز گەیشتینە مووسڵ، زێی دیجلەمان بەپردێك بڕی کە بە بەلەم دورستکرابوو، بەهۆی توندی پلەی گەرمیەوە ودەمووچاوم سووتا ودەستیشم سووتایەوە، کاتێك گەیشتمە شارەکە راستەوخۆ چوومە یەکێك لەگەرماوەکان بۆ ئەوەی خۆم بشۆم، کە بەراستی تیایدا پشووم دا.

مووسڵ دەکەوێتە سەر بەرزاییەك لەلای راستی دیجلەوە، وەك خەڵکەکە دەڵێن مووسڵ (نەینەوا)ی کۆنە، کە سێیەم پایتەختی ئاشووریەکانە، من نازانم ئەو شارە پێشتر چۆن بووە، بەڵام ئێستا زۆرێك لە خانووی نەخشێندراوی تیایە وئەوە جگە لە بوونی چەند گەرماوێك وچەندین مزگەوت وشوینی خودا پەرستی، کە هەموویان لەبەرد دورستکراوە، ئەوەی کە بینیم لەم شارەدا کردەوەکانیان توندی پێوە دیار نییە، وەك چۆن لەشارە رۆژهەڵاتیەکان بینمان، بۆ نموونە ئافرەت لێرە سەرپۆش نییە، وەك ئافرەتانی وڵاتانی ئەورووپی، نێوەندی شارەکە رێژەی دانیشتووانی زۆرە وچەندین ئاین تیایدا بەدی دەکرێ، بەڵام زۆربەی دانیشتتوانەکەی کوردن، لەگەڵ رێبەرەکەم بەنێو شارەکەدا سووڕاینەوە، ئەو شارە بازاڕێکی فراوانی تیایە وهەموو جۆە کەلوپەلێکی تیایدا بەدەست دەکەوێ، کە دانراوە بۆ فرۆشتن، وەك جلوبەرگ وچەندین کەلوپەلی دیکە، تێبینی ئەوەم کرد خەڵکی ئەو شارە زۆر گرنگی بە پیشەسازی دەدەن وجیا لەشوێنەکانی دیکە لەوەتەی لەهیندستانەوە بەڕی کەوتم، وەك بەگەڕکەوتنی چەندین کارگە کە بەرهەمەکانی لەسەرەوەی بەرهەمەکانی ئەورووپیە، دەبینی رێشمە وسەرجەکانی بەشێوەیەکی زۆر جوان رازاوەتەوە، ئەوە جگە لەوەە بەرماڵی حەریری بەچەند گوڵ رازاوەتەوە، هەروا جلوبەرگ وپۆشاکەکانی پیاو وئافرەت بەشێوەیەکی زۆر جوان نەخشێندراوە، هەروا چەندین کارگەی ئاسن ومسیان هەیە، لەو ئاسن ومسانە چەندین شت دورست دەکرێ ولە زێی دیجلەوە بەرەو باشوور تا بەسرا دەگوزازرێتەوە.

شاری مووسڵ دیوارێکی بەهێز لەچوارچێوەی داهەیە، کە بە بەرد دورستکراوە، هەروا ئەو زەویانەی کە لەدەوری دیوارەکەدا هەیە، هیچ خانوویەکی لێ دورست نەکراوە، ئەوەی تێبینی دەکرێ کاتێك سەیری ئەو زەویانە دەکەی، هەست بەوە

دەکەی کە ئەم شارە پێشتر زۆر قەرەباڵغ بووە ولەئێستاش زیاتر ڕێژەی دانیشتووانی زیاتر بووە.

لەبەرامبەر خاندا هەڵوستەکەیەم کرد، لەتەنیشت ئەویشدا دادگا .بەرچاو دەکەوێ، دادگاش لێرە زۆر خێرایە، تۆمەتبار تەنها پێنج خولەك بەرامبەر دادگا رادەوەستی، ئەگەر ئاشکرا بێ ئەوە تاوانبارە، ئەوا دەبرێتە بەندینخانە تا سزای خۆی وەربگرێ، لێرە دادگا لەگەڵ ڕۆژهەڵاتندا دەبێتەوە، بەڵام زۆر بەردەوام نابێ، تەنهاش دوو کاتژمێر بەردەوام دەبێ، دادگاش دەیەوێ زۆر بەخێرایی کارەکانی تەواو بکات.

لەمووسڵدا چاوم بە فینسی قەشە کەوت، کە ناوی خۆی مەنسوور بوو، بە زمانی لاتینی قسەم لەگەڵدا کرد، ئەو زمانی لاتینی زۆر بەباشی دەزانی، هەروا باسی لەوە کرد کە نامەیەکی لە ئەستەمبۆڵەوە بۆ هاتووە تیایدا باس لەوە دەکات کە فەڕەنسیەکان وڵاتەکەیان داگیر کردووە وهاوکات ئەو زۆر گرنگی بەم بابەتە دەدا، ئەو پیاوێکی ناسك وخاوەن ڕۆشنبیریەکی زۆر بوو، کە جیا لە هەموو قەشەکانی دیکە زانیاری زۆری لا بوو، کە پاپا خۆی نامەی بۆ ناردووە، دواتر نێردراوەتە مووسڵ واتە پێش دوو ساڵ وهەشت مانگ ئێستاش دەیەوێ بچێتە هیندستان، لەلایەکی دیکەوە لەو شارەدا هیچ کەسێکم نەبینی زمانی فەڕەنسی وئینگلیزی بزانێ.

لێرەدا بۆم دەرکەوت کە ناتوانم درێژە بە گەشتە ئاساییەکەی خۆم بدەم، چونکە خەڵکی جزیرێ شۆڕشیان دژ بە دەسەڵاتە تورکەکان کردووە، لەوێدا پاشایان کوشتووە وچەندین تاوانی دیکەیان ئەنجامدا وەك کوشتن، هاوکات پێیان گوتم کە بەبێ پاسەوان ڕێگە نەبڕەم، بۆیە ڕێبەرەکەم زۆر چاوەڕوانی کرد، تا ئیزن لەپاشا وەربگرێ، دواتر پاشا فەرمانی دا بەپێکهێنانی پانزدە پاسەوان وئەفسەرێك تا پاسەوانیم بکەن، ئەمەو لەکاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆی ڕۆژی بیست وشەشی تەموز پێیان ڕاگەیاندین کە پاسەوان وخزمەتکارەکان ئامادەن بۆ گەشتەکە، کاتێك سواری ئەسپەکانمان بووین وهەنگاومان نا بینیمان پاسەوان وخزمەتکارەکان لەدەروازەی ڕۆژئاوای شارەکە چاوەڕوانمان دەکەن، بەڵام زۆر بێ ئومێد بووم کاتێك بینم ڕێبەرە تەتەریەکەی هاوڕێم لەگەڵیاندا نییە، ئەمەش بەهۆی گواستنەوەی

کەلوپەلەکانم، بەلاّم من وام زانی ئەو تەتەریە ئەو کەلوپەلانەی من دەدا بەو ڕێگرانە کە لەڕێگەدا ڕووبەڕوومان دەبنەوە، ئەمەش وەك بەرتیلێك پێیان دەبەخشیٚ، بەلاّم کاتێك بیٚ ئومێد بووم، لێرە بڕمارم دا تەنها لەم ولاّتەدا بیٚ دەنگ بم، هەموو ئەسپەکان زۆر باشبوون، بەلاّم دەبوایە سەد وپەنجا ببڕین تاوەکو دەگەینە چەند ئەسپێکی دیکەی ئامادەکراو تا ڕێگە ببڕین، لەهەمووی جوانتر ئەسپەکەی ئەفسەرەکە، چونکە عەرەبی ورەنگی سپی بوو، کاتێك شارەکەمان بەجێهێشت زۆری نەبرد زۆرێك لەئەسپ سواران رمبازیان دەکرد، ئەمەو سەرباز وئەفسەرەکە هەر یەکەو جلێکی تایبەتی لەبەردا بوو، ئەفسەرەکە تەربووشێکی لەسەردا بوو کە درێژیەکەی دوو پیٚ زیاتر بوو، ڕەنگی تەربووشەکەش سوور بوو، هاوکات ئەفسەرەکە تەمەنی دەگەیشتنە سی سالاّن وریشێکی درێژی هەبوو، بەلاّم سەربازەکان جلی سپیان پۆشی بوو، هەروا تەبرووش وعەمامەیان لەسەر بوو، ریشیان پاك تاشی بوو، بەلاّم سمێلّیان هەبوو.

ئێمە ناچار بووین لەسەر کەناری دیجلەدا هەنگاو بنێین، کاتێك بەنزیك گوندەکاندا تێدەپەڕین تێبینی ئەوەتت دەکرد، کە کشتتووکالّێکی فراوان لەم دێهاتانە هاتۆتە ئاراوە، چونکە دەتبینی بەربوومێکی زۆر بەرهەم هێندراوە، وەك گەنم جۆیەکی زۆر بەرهەم هەلّدرابۆوە، هەندێك لەگوندەکاتیش لەسەر کەناری دیجلە لەسەر بەرزایی دابوو.

لەوکاتەی کە بۆ جارێکی دیکە دەستمان بەگەشتەکەمان کردەوە کاتژمێر هەشت بوو، ئەمەو پاسەوانەکانمان خۆیان بۆ ئامادە دەکرد، کاتێك ڕێگەمان دەبڕی ڕێگە زۆر ناخۆش بوو، چونکە ڕێگەکە هەمووی چالّ وکەند وڕێگەیەکی ناخۆش بوو تەنیا شوێنی یەك ئەسپ هەبوو، دووبارە گەڕاینەوە کەناری دیجلە، شەوێکی زۆر تاریك بوو ڕێگەکە زۆر خراپ بوو بۆیە ئێمە زۆر بەناخۆشی هەنگاومان دەنا، دواتر بەرەو باشوور ڕۆیشتین وزێی دیجلەمان بەجیٚ هێشت و بەرەو لای ڕاست هەنگاومان نا ودواتر گەیشتینە کاروانێك کە بۆ (دیار بەکر) دەڕۆیشت.

ئەو کاروانە نزیکەی دووسەد ئەسپ وسیٚ کەر وبارگنێك پێکهاتبوو، یەکێك سەرپەرشتی ئەو کاروانەی دەرکرد، لەگەلّ ژمارەیەکی کەم لە پاسەوان، کاتێك کە گەیشتینە ئەو کاروانە کاتژمێر یەکی شەو بوو، دواتر ژمارەیەك لە تەتەریەکان

هاتنە پاڵ ئێمە کە هەموویان بەرەو دیار بەکر دەڕۆیشتن، لەگەڵ ئەوەی ئەوان هەموو ئامادەکارییەکیان هەبوو تا خێر هەنگاو بدەن، بەڵام ترسیان لەوە بوو زۆر بەخێرایی ئەو ڕێگە سەختە ببڕن.

لەو شوێنانە شوێنێکی دیاری کراو نییە تا لێی بمێنیتەوە، چونکە ئێستا ئەم شوێنانە بۆتە گۆڕەپانی ڕێگرەکان، کاتێك کەتەتەریەکان هاتنە پاڵ ئێمە ژمارەی ئەسپەکان بوو بەچل، بۆیە هەموومان زۆر بەخێرایی دەڕۆیشتین لەکاتژمێرێکدا شەش میلمان بڕی، دواتریش لەنزیك زێیەکدا راوەستاین کە دەکەوێتە نێو دۆڵێکی نزم، هاوکات هەموو کاروانە راوەستا ورەشماڵمان هەڵدا، هاوڕێیە تەتەریەکانمان ئەمجارەیان خۆیان بۆ سەفەر کردن ئامادە نەکردبوو، بۆیە کەلوپەلی پێویستیات پێ نەبوو، لەمەوەش لەسەر زەویەکی رووت پاڵم دایەوە تا بەیانی، کاتژمێر حەفتی بەیانی بەگەرمی تیشکی رۆژ لە خەو هەڵسام، دواتر چوومە نێو رەشماڵەکە تا لەوێدا نانی بەیانی بخەوم، لەنزیك ئەو زێیەدا دۆڵێکی فراوان هەیە وئەمەو ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی ئەو کاروانەی دەکرد، بەدرێژایی رۆژ چاودێری ئەو شوێنەی دەکرد، چونکە لە زۆر شوێن بەرزایی دورست کرابوو، دیارە ئەمەش بەمەبەستێك ئەنجام دراوە وکات وپارەیەکی زۆری ویستووە، سەرپەرشتیکاری کاروانەکە لەو بڕوایە دابوو، کە رووبەڕووی هێرشێك دەبنەوە، بۆیە هەموو شتێکی ئامادە کرد بۆ رووبەڕوو بوونەوەی ئەو هێرشە لەناکاوە، دواتر پەنجا کەسی ئامادە کرد تا لە حاڵەتی ئاگایدا بن بۆ ئەوەی ئامادە بن لەهەر کاتێکدا بڵێت بڕۆین، هەروا تەتریەك باسی لەوە کرد کە زۆری نەمابوو لەنێو بچێت بەهۆی رووداێکەوە، بۆیە ئەوەی بەبیر هێنایەنەوە کە کاتێك هێرش کرایە سەرمان دەبێ، بەهێزێکی زۆرەوە بەرپەچیان بدەینەوە، چونکە هێرش بەرەکان بەهەموو جۆرە چەکێك هێرش دەهێنن، بەشێوەیەك زۆربەی چەکەکان رمن، بەڵام ئەمە هیچ سوودێکی نییە، بەرامبەر هێزی نیزامی ئەورووپی، بەڵام رم ئێستا لەم وڵاتەدا بۆ شەڕ بەکار دێ وباوە.

هەندێك لەخەڵکیش تیروکەوان وتیریان بەکار دەهێنا، سەرپەشتکارەکەش یەکێك لەو کەسانە بوو، کەلەسەر ئەسپەکەیەوە دەیتوانی زۆر بەگونجاوی لە ئامانجی خۆی بدات.

لەلایەکی دیکەوە رووبەری ئەو زەویەی تیایی بووین هەمووی بە گیا داپۆشراو بوو، کە لەهەندێك شوێندا ئەو گیایانە زۆر بەرز بوو، لەهەندێك شوێنیشدا درِك ودالّەکان هەمووی وشك بوو بۆوە، بۆیە هەندێك لە کەسانی کاروانەکەمان باسیان لەوە کرد، تا ئاگر بەردەنە ئەو درِك ودالّە وشکانە.

لەکاتژمێر پێنج ونیو ئەو شوێنەمان بەجیّ هێشت وئەو پاسەوان وئەفسەرەی کە لە مووسلّەوە یاوەرم بوون گەرِانەوە، دواتر هەنگاومان نا، دوای ماوەیەکی زۆر لە رۆیشتن هەندێك لەوانەی لەکاروانەکە دابوون، بەباشیان زانی لەتەنیشت یەکێك لە زیّ ورووبارەکان رەشمالّ هەلّدەن بۆ پشوودان، هاوکات تەتەریەکان کەبیست کەس بوون ودەچوونە دیار بەکر ولەگەلّ ئێمەدا بوونە هاورِیّ وئێمە وئەوان کاروانەکەمان جیّ هێشت وبەرەو شوێنی مەبەستی خۆمان هەنگاومان نا، ئەمەو لەکاتژمێرێکدا شەش میل دەرِۆیشتین، لەرێگەدا شوێنەواری هیچ کشتووکالّ وکێلّگەیەکمان نەبینی وهەتا هیچ دانیشتووانێکمان نەبینی، بەلاّم لەگەلّ رۆژهەلاّهەتدا چەند زێیەکمان برِی کە هەموو لایەکی بەدارودرخت ودرِك ودالّ داپۆشرَاوە، لەوێدا هەندێك لە بەرازە درِەندەکانمان بینی، کاتێك لە زێیەکە نزیك بوومەوە مێگەلێك لەو بەرازانەم بینی، کە نزیکەی بیست بەراز دەبوو وبەرەو زێیەکە هەنگاو دەنێن، بۆیە من زۆر بەخێرایی سواری ئەسپەکەم بوومەوە وچەند کەسێك لەوێدا بوون وبانگم کردن تا بەخۆیان رمەکانیان بێن، لەوکاتەدا مێگەلەکە بەدواماندا هاتن وئێمەش رامان دەکرد، ئەو کەسانەی کە رمەکانیان پیّ ئامانجەکانی خۆیان پێکا کاتێك یەکێك لەوانە لەنێوەندی درختەکاندا خۆی شاردەوە وتوانی یەکێك لەو بەرازانە لەچەند شوێنێنەکەوە بپێکی، منیش کاتێك بەرازەکان لەدوام بوون، توانیم بەپێی ئەسپەکانم رووبەرِوویان ببمەوە وبەرازەکان ناچار بکەم وازم لێبێن، بەلاّم زۆری نەمابوو خۆم وئەسپەکەم بکەوین، لەکاتی ئەم جۆرە رووداوانە ئەگەر لەسەر ئەسپەکەم بکەوتبوومایە خوارەوە ئەوا بێگومان بەرازەکان دەیان کوشتم، دوای ئەوەی توانیمان لەو گرفتە خۆمان رزگار بکەین، لەپاشاندا زۆر ترساین هێرش بکەنەوە سەرمان، دوای ئەوەی یەکێك لە بەرازەکان لەچەند

شوێنێکەوە بریندار بوو، بەدوایەوە بووین تاوەکو کوشتمان، ئەو بەرازەش قەبارەی مامناوەندی بوو ورەنگی سوورێکی تاریك بوو، هەموو ئەوانەی لەگەڵمان بوون لەدوورەوە چاودێریان دەکردین ودەیانویست بەشداریمان لەگەڵدا بکەن، ئەم رووداوەش لەدیدی من گەورەترین رووداو بوو کەمن رووبەڕووی بوومەتەوە، لەراستیدا من ژمارەیەك لە بەرازی دڕندەم بینی وئارەزووم لەوە بوو هێرش بکەمە سەریان، بەڵام ئێستا گەیشتمە ئەو راستیەی کە ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە زۆر گێلانە بوو، تا ئێستاش هیچ ئاژەڵێکی دیکەم نەبینووە بەو جۆرە دڕندە بێ، هەر لەوێدا گورێکمان بینی کە لەو ناوە دەسوڕایەوە وبەدوای نێچیرێکدا دەگەڕا.

دواتر دەستمان بەگەشتەکەمان کردەوە تا کاتژمێر هەشت ونیو بۆ هەر کاتژمێرێك شەش مێلمان دەبڕی، هاوکات گەیشتنینە یەکێك لەو گردەلۆکانەی کە دورست کرابوو لە نزیك زێیەك کە ئاوەی زۆر سازگار بوو وبەنێو دۆڵێکی فراوان تێدەپەڕی، وەك باسم کرد شوێنێکی دیاری کراو نەبوو تا بۆماوەیەك تیادا جێگیر بین وبۆیە تەنها بۆ پشوودان لە شوێنێك دەماینەوە، ئەو جۆر ە شوێنانەش هەموو کاتێك شوێنێکە جێگیر نییە، بەڵام ئەوەی زۆر ئارەزووم بوو کاتێك دەگەیشتمە هەر زێیەك بەئاوی سارد سەرم دەشوشت.

لەکاتژمێر پێنجی دوای نیوەڕۆی پاش ئەوەی دە میلمان بڕی بوو، دووبارە سواری ئەسپەکانمان بووینەوە، بەرەو رۆژئاوا رۆیشتین ولەرێگەدا چەندین گوند ودیمەنی جوان ورەنگینمان بینی کە لەهەموو لایەکەوە خەڵك تیایدا دەژیا، دووبارەش گەڕاینەوە سەر کانیە جوانەکان ولەوێدا ئاومان دەخواردەوە، هەروا کاتێك گەیشتینە سەر زێیەك لەدوورەوە شارێکی وێرانبوومان بینی کە لەسەر شێوەی مانگ بوو، لەدوێدا چەندین بەردم دۆزیەوە کە شتی لەسەردا هەڵکێندرابوو، بەڵام هیچ بەردێك شتی لەسەر نە نوسرابوو، هاوکات لەوێدا تابووتێکێمان دۆزیەوە بەڵام هیچی لەسەر نەنوسرابوو، ئەوە جگە لەوەی هیچ جۆرە گیانەوەرێکیشمان لەوێدا نەبینی، جگە لەبەرازە کێویەکان وگورگ وهەندێك لە هەڵۆ، ئەو ئەو زێیەی لەتەنیشتیا بوو پڕ بوو لەماسی.

بەردەوام بەرەو رۆژئاوا دەڕۆیشتین تا کاتژمێر نۆ کاتێك یەکێك لەجۆگە وکانیەکمان بینی یەکسەر لامان دا، دواتر بەرەو باکوور هەنگاومان نا، لەوکاتەدا کۆمەڵێك لەئێمە رێگەکەیان ون کرد، بەڵام یەکێك لەئێمە چەندین تەقەی کرد، تا ئەو کۆمەڵەیە ئێمەی دۆزیەوە، لەگەڵ ئەوەی رێگەکە زۆر ناخۆش بوو، بەڵام لەنیوەشەودا توانیمان بگەینە شوێنێك کە پێی دەڵێن (تیس) کە شوێنێك بوو لەبەرزایی گردێکدا پێکهاتبوو لە چەند خانوویەك، لەوێدا بۆ ماوەی کاتژمێرێك پشوومان دا، لەوێدا بەهۆی برسیەتی هەستم بەماندووبوونێکی زۆر دەرکرد.

لەکاتژمێر دوانزدە ونیو پاش ئەوەی کەمێك پاڵمان دایەوە تیسمان بەجێ هێشتت، بەڵام زۆری نەبرد رێگەمان لێ بزر بوو وکەوتینە ناو چەندین گۆماو وزەلکاو، گەیشتینە جۆگەیەککە ئاوەکەی لەزنجیرە چیاوە دەهاتە خوارەوە، دواتر هەنگاومان نا تا لەکاتتژمێر سێی رۆژی یەکشەممەی بیست ونۆی تەموزی ساڵی ١٧٩٧ گەیشتنینە شاری (نسیبین).